پليخانۆف

# هونەرو ژيانی كۆمەڵايەتی

و: حەمە كەريم عارف


كوردستان – هەولێر

٢٠٠٥



**ناوی كتێب: هونەرو ژيانی كۆمەڵايەتی**

– نووسينی: پليخانۆف

– وەرگێڕانی و: حەمە كەريم عارف

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

– بەرگ: هۆگر سديق

= سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– تيراژ: ٧٥٠ دانە

– ژمارەی سپاردن: ١٢٥

–– چاپی يەكەم: ٢٠٠٥

– نرخ: ١٠٠٠ دينار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجيرەی كتێب – ١٢– (١١٥)



ناونيشان

دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكريانی

پۆستی ئەلكترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: 2260311




## بەشی یەکەم

لە سەرانسەری ئەدەبیاتی تا رادەیەك گەشە كردوودا، مەسەلەی پێوەندی نێوان هونەر و ژینی كۆمەڵایەتی رۆڵێكی گرنگی دیتوە، ئەم مەسەلەیە لە دوو روانگەو رێبازی تەواو دژ بە یەك چارەسەر كراوە و هێشتاش هەمان ئەم دوو رێبازە لە برەو دایە بۆ چارەسەركردنی ئەم مەسەلەیە.

ژمارەیەك گوتویانەو دەڵێن كە مرۆڤ بۆ رۆژی هەینی دروست نەكراوە، بەڵكو هەینی بۆ مرۆڤ دروست كراوە، كۆمەڵگە بۆ هونەرمەند نییە، بەڵكو هونەرمەند بۆ كۆمەڵە.

هەندێكی دی ئەم دید و بۆچوونە لە بنەڕەتەوە رەفز دەكەن. بە باوەڕی ئەوان هونەر، خۆی ئامانجی خۆیەتی. گەر هونەر بكرێ بە هۆ و بخرێتە خزمەتی كۆمەڵێ ئامانجی نامۆوە، گەر ئامانجەكان رەسەنیش بن. ئەوا بایەخی كارە هونەرییەكە دا دەبەزێ وكەم دەبێتەوە.

بۆچوونی یەكەم، لە ئەدەبیاتی پێشكەوتوخوازی ئێمەدا لە ساڵانی ١٨٦٠دا بە جۆرێكی ئاشكرا و پرشنگدار رەنگی داوەتەوە. جگە لە پیسارەف، كە هێندە بە گەرمی هەواداری لەم بۆچوونە دەكرد گەیاندبویە رادەی كاریكاتۆر، ئەوا دەتوانین بڵێین چرنشفسكی و دابرلیوبوف دیارترین و باشترین نوێنەرانی ئەم بۆچوونەن لە نێو رەخنەگرانی ئەو سەردەمەدا.



چرنشفسكی لە یەكێك لە وتارە رەخنەییەكانی سەرەتای ژیانی رەخنەگری دا دەڵێ: (هونەر بۆ هونەر) لەم سەردەمەی ئێمەدا هێندە نامۆ و سەیر و سەمەرەیە وەكو ئەوەیە پێی بڵێی (سامان بۆ سامان) و (زانست بۆ زانست) و شتی تری لەو بابەتە دروشمە. هەر جۆرە چالاكییەكی بەشەری بگری پێویستە لە خزمەتی ئیسناندا بێ و لەمە بترازێ دەبێ بە هەوڵ و تەقەلایەكی بێهودە و بێ بەر. ساان بۆ ئەوەیە كە مرۆڤ سوودی لێ وەربگرێ، زانست بۆ رێنوێنی بەشەرە، هونەریش دەبێ لە پێناوی خزمەتێكی بنەڕەتی و سەرەكی دا بێ، نەك لە چوارچێوەی لە زەت بەخشینێكی بێ بەردا قەتیس بمێنێ.

بە باوەڕی چرنشفسكی بایەخی هونەر بە تایبەتی (شیعر) لەوەدایە كە چەند شارەزایی و ئاستی رۆشنبیری كۆمەڵ بەرز دەكاتەوە، تا چ رادەیەك نهێنییەكان بۆ كۆمەڵ كەشف دەكا.

چرنیشفسكی دەڵێ هونەر، یا وردتر بڵێم، شیعر (تەنیا شیعر) چونكە هونەرەكانی دی كەمتر ئەم تایبەتمەندییە یان تێدایە، زانیاری و ئاشناییەكی دیار لە نێو كۆمەڵی خوێنەراندا بڵاو دەكاتەوە و بە دەستكەوتەكانی زانستیان ئاشنا دەكا، بایەخی گەورەی شیعر لە ژیاندا، لەمەوە سەری هەڵداوە.

هەمان بیروبۆچون، لە نووسراوە نێو دارەكەیدا (پێوەندی ئیستاتیكی نێوان هونەر و واقیع) دا رەنگی داوەتەوە و دووبارە كراوەتەوە.

بەپێی تیوری هەڤدەی ئەم لێكۆڵینەوەیە، هونەر تەیا ژیان عەكس ناكاتەوە یا نانوێنی بەڵكو رونیشی دەكاتەوە. واتە ئیعتباری كاری هونەری لەوەدایە كە (دادوەرییەكە دەربارەی دیاردەكنی ژیان) بایەخی بنەڕەتی هونەر لە

روانگەی چرنشفسکی و دابرولیوپفی شاگردییەوە لەوەدایە کە هەم ژیان عەکس دەکاتەوە و هەم دیاردەکانی ژیان تاوتۆ دەکا و هەڵی دەسەنگێنێ.[1] ئەمە تەنیا دید و بۆچوونی رەخنەگرانی ئەدەبی و تێوری رێژانی هونەری نەبوو، هەرگیز نکراسوف بە رێکەوت و خۆ بەخۆ ناوی کۆمەڵە شیعرێکی خۆی نەنا (شیعری تۆڵە وخەم) لە یەکێك لەم شیعرانەدا هاووڵاتیەك روو دەکاتە شاعیر و دەڵێ:

**تۆ، شاعیر، کە هەڵبژاردەی خودایانی**
**بۆ ئەوەیە حەقیقەتە ئەبەدەییەکان بڵێی**
**پێت وا نەبێ ئەوەی نانی نییە**
**شیعری پڕ ئیلهامی تۆ نابێ بە پێخوری**
**پێت وا نەبێ مرۆڤ لە ئەزەڵەوە مەرگی چارەنووسە**
**خوا لە رۆحی مرۆڤدا نەمردووە**
**زەنگ و شیوەنی هەر دڵێکی پڕ باوەڕ**
**بەردەوام دەژنەوێ،**
**وەکو هاووڵاتی بە! کارگوزاری هونەر بە!**
**بە شادی هاووڵاتی خۆت شاد بە**
**بەهرەت بکە بە دەستگێری هەستی ئەشقێ**
**کە هەموو جیهانی گرتۆتەوە.**

(هاووڵاتییەکەی) نیکراسوف بەو قسانە بۆچوونی خۆی لەمەڕ هونەر دەردەبڕێ، ئەمە هەمان بۆچوونە کە مامۆستایانی پایەبەرزی هونەرەکانی پەیکەرسازی و نیگارکێشی باوەڕیان پێی بوو، بۆ وێنە پروف و کرامسکویش وەکو نیکراسوف هەوڵیان دەدا تا (هاووڵاتی) بن. ئەوانیش وەکو ئەو لە رێگای هونەرەوە دیاردەکانی ژیانیان تاتۆ دەکرد و هەڵیان دەسەنگاندن.[2]



لەسەردەمی نیکولای یەکەمدا، پوشکین سەرسەختترین دژمنی ئەو بۆچوونە بوو دەربارەی هونەر، هەموو کەسێك ئاگاداری شیعری (خەڵك) و (شاعیر) پوشکینن. ئەو کەسانەی کە داوا لە شاعیر دەکەن بە زەبری شیعرەکانی عادەتەکانی کۆمەڵ بەرەو چاکی بگۆڕێ، زۆر بە رەقی و بگرە بێ ئەدەبانە لەلایەن شاعیرەوە وەڵام دەدرێنەوە.

**لاکەون! شاعیرێ شاعیر بێ**
**بە هیچ جۆرێ لە خەمی ئێوەدا نابێ**
**پیاو بن و پیاوانە لە نێو خراپی خۆدا وشك هەڵێن**
**ئاوازی ئەشق ناتان بزوێنێ**
**ئێوە چەشنی گۆڕ لە ژیانەوە دوورن**
**سەودای گەوجێتی و شەیتانانەتان**
**تا ئێستا هەر**
**کوتەك و زیندان و تەور بووە،**
**ئەی کۆیلە گەوجەکان! ئێوە هەر شایستەی ئەوەن.**

پۆشکین لەم چەند دێرە شیعرەی خوارەوە کە زۆر جاران باس دەکرێ و بە سەرزارانەوەیە، رۆڵی شاعیری بەمجۆرە دەست نیشان کردووە.

**ئێمە بۆ هەراو ئاژاوەی ژیان نەهاتووینە دنیاوە.**
**نە بۆ سەرکەوتن نە بۆ خەبات.**
**دروست بوونی ئێمە بۆ ئیلهام وەرگرتنە**
**بۆ سروودی خۆش ئاهەنگ و بۆ عیبادەتە**

ئێمە لێرەدا سەبارەت بە تێوری هونەر بۆ هونەر رووبەرووی سەرسامترین دیاردە دەبینەوە. لە خۆرایی نییە کە نەیارانی بزووتنەوەی ئەدەبی سالآنی شەست، بەو هەموو تاسەیەوە ناوی پۆشکین دێنن.

باشە لە نێوان ئەم دوو بۆچوونە دژ بە یەکەدا کامیان دروستە؟ بەر لەوەی

بێینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکە، پێویستە ئەوە بزانین کە جۆری پرسیاری کردنەکە هەڵەیە، لە راستیا نە ئەم پرسیارە و نە چ پرسیارێکی دی لەو بابەتە، ناکرێ لە روانگەی (ئەرکەوە) بخرێتە بەر وردە بینی لێکۆڵینەوە، گەر هونەرمەندانی وڵاتێك، لەسەر دەمێکی تایبەتی دا خۆ لە (ئاژاوەی ژیان و خەبات) دەدزنەوە و لەسەردەمێکی دیدا بە پێچەوانەوە، زۆر بە گەرمی بە پیری خەبات و لق و پۆپەکانییەوە دەچن، لەبەر ئەوە نییە کە کەسێك لە دەرێ را ئەرکی جۆراوجۆریان لەسەر دەمانی جیاواز دا بۆ دیاری دەکا، بەڵکو لەبەر ئەوەیە لە هەندێ هەلومەرجی کۆمەڵایەتی دا جۆرە هەستێکیان هەیە و لە هەلومەرجێکی دیدا جۆرە هەستێکی تریان هەیە، بۆیە پێویستە پرسیارەکە نەك لەبەر رۆشنایی ئەو شتەدا کە پێویستە بێ، بەڵکو لەبەر رۆشنایی ئەو شتەدا کە هەبووە و هەیە شی بکرێتەوە. لەبەر ئەوە ئێمە پرسیارەکە بەمجۆرە دەخەینە روو:

کام هەلومەرجی سەرەکی کۆمەڵایەتی دەبێتە مایەی ئەوەی کە رێبازی هونەر بۆ هونەر، لای هونەرمەندان و هونەردۆستان بێتە ئاراوە و سەقامگیر ببێ؟

وەختێ وەڵامی ئەم پرسیارەمان بە دەست هێنا هەنگینێ بە ئاسانی دەتوانین وەڵامی پرسیارێکی دی بدەینەوە کە لە پرسیاری یەکەمەوە سەر هەڵدەدا و بەهەمان ئەندازەی پرسیاری یەکەم جێی سەرنجە، کامە هەلومەرجی سەرەکی کۆمەڵایەتی دەبێتە مایەی ئەوەی کە رێبازی هونەری ئامانجدار واتە ( هەڵسەنگاندن و تاوتۆکردنی دیاردەکانی ژیان بکا بە ئامانج)



لای هونەرمەندان و هونەر دۆستان بێتە ئاراوە و سەقامگیر ببێ؟

پرسیاری یەکەم دەمانباتەوە سەر پۆشکین.

پۆشکین لە سەردەمانێکا داکۆکی لە دیدوبۆچوونی (هونەر بۆ هونەر) نەدەکرد، خۆی لە خەبات نەدەدزییەوە بەڵکو بەرەو پیری دەچوو، ئەمە لەسەردەمی ئەلسکاندەری یەکەمدا بوو، لەو سەردەمەدا قەناعەتی وا نەبوو کە (گەل) شایەنی حەپس و تێ هەڵدان و زنجیرە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە (داستانی ئازادی) دا تورەیە و هاوار دەکا:

**ئەفسوس هەر کوێ دەڕوانم**
**هەر قامچییە، هەر زنجیرە،**
**رووی درێو و شوومی یاسا**
**ئەشکی بێ دەسەڵاتی و ئەسارەت**
**لە هەموو جێیەك دا فەرمانڕەوایە**

پاشان بیرو بیرکردنەوەی بە تەواوی گۆڕا و لە سەردەمی نیکۆلای یەکەمدا دیدو بۆچوونی (هونەر بۆ هونەر)ی پەسەند کرد، ئەم گۆڕانە قوژە لە کوێوە سەر هەڵدەدا؟

سەرەتای فەرمانڕەوایی نیکۆلای یەکەم رێکەوتی کارەساتی (دیسامبەرییەکان)ی کرد، ئەم مەسەلەیە کارێکی زۆر گەورەی کردە سەر گەشە کردنی پاشتری کۆمەڵی ئێمە و سەر چارەنووسی پوشکین، لەگەڵ هەرەس هێنانی دیسەمبەرییەکاندا رۆشنبیرترین و پێشڕەوترین نوێنەرانی کۆمەڵی ئەو سەردەمە تیا چوون و نەمان، ئەمەش کردییە کارێ کە ورە و بیرو بیرکردنەوەی پۆشکین بە تەواوی لەق ببێ.

هەرزەن، دەڵێ من لەو سەروبەندەدا منداڵ بووم، بەڵام چاکم لەبیرە کە

کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی زۆر بە خێرایی بەرەو داوەشین و هەرەس هێنان دەچوو، کە نیکولا هاتە سەر حوکم وەزع وحاڵەکە هێندەی دی خراپ بوو، سەربەخۆیی ئەشراف و شەهامەت و دەسەڵاتی خانەوادەکانی سەردەمی ئەلکساندر، لە ساڵی ١٨٢٦دا بە جاریٚ لە بەین چوو.

ژیان بەسەربردن لە کۆمەڵگەیەکی ئاوهادا بۆ پیاوێکی هەست ناسك و هوشیار، زۆر دژوار و زەحمەت بوو. هەرزەن دەڵیٚ: هەموو شتێکی دەوروبەرمان مات و کپ، نا ئینسانی، بیٚ تروسکە، گەوجانە و بیٚ مەعنا بوو، دەتروانییە هەر لایە ترس و ترساندن هەرەشەی لێدەکردی و گەمارۆی دەدای.

وەختیٚ کە شیعری (گەل) و (شاعیر) بڵاو بوونەوە، پۆشکین لە نامەکانی خۆیدا بەردەوام بێزار و سکاڵای خۆی لە وەزع و حاڵی بیٚ سەروبەری باوی هەردوو پایتەختەکەمان دەدەربڕی. بەڵام پۆشکین تەنیا لە بیٚ سەروبەری کۆمەڵگەکەی دەوروبەری خۆی بێزار نەبوو، بەڵکو پێوەندییەکانی لەگەڵ (ئەنجومەنانی ڕێبەرایەتی)شدا هێندەی دی دەی ڕەنجاند و بێزاری دەکرد. بە پێی ئەو چیرۆکە خەیاڵییە زۆر باوەی وڵاتی ئێمە، نیکولای یەکەم لە ساڵی ١٨٢٦ دا لە هەموو تاوانە سیاسییەکانی سەردەمی لاوی پۆشکین خۆش بوو، هەر بەوەندەوە نەوەستاو بەڵکو پۆشکینی لە خۆی نزیك خستەوە و هێنایە پەنای خۆی.

دیارە ئەم چیرۆکە خەیاڵییە چ بنج و بناوانێکی ڕاستەقینەی نییە، نیکولا و بنکندروڤ دەستە ڕاستی، نەك هیچیان بە پۆشکین نەبەخشی، بەڵکو پاش سوکایەتی پێکردنێکی زۆر و لە تەحەمول بەدەر، ئەوجا ویستیان پەنای



بدەن، چونکە ئەوەتا بنکندروف لە ساڵی ١٨٢٧ دا لە ڕاپۆرتێکیا بۆ نیکولا ئەمەی نووسیوە: (لە سەیرانگای ئینگسیاندا پۆشکینم بینی، پاش ئەوەی قسەم لەگەڵ کرد، هێندە بە گەرمی کەوتە ستایشی، خاوەن شکۆتان کە ئەوانەی لەگەڵی شامیان دەخوارد ناچار بوون پێکەکانیان بە سەلامەتی خاوەن شکۆ هەڵبدەن، هەرچەندە پوشکین کابرایەکی هیچ و پوچ و بیٚ بایەخە، بەڵام ئەگەر بتوانین قەڵەم و زمانی ئەو کابرایە بخەینە ژێر ڕکێفی خۆمانەوە سوودی زۆری لێوەردەگرین.)

ئەم قسانەی دوایی بە ئاشکرا پەردە لەسەر ئەو پەنادارییە هەڵدەماڵیٚ کە نیکولای لە پوشکینی کردووە، ئەوان دەیانویست بیکەن بە شاعیری دەرباری ڕژێمی وەخت. نیکولای یەکەم و بنکندروف هەوڵیان دەدا شیعری یاخی و سەرکێشی پۆشکین بخەنە خزمەتی دەم و دەزگاکەی خۆیان.

وەختی فیلد مارشال یاسکیوڤیچ پاش مەرگی پۆشکین لە نامەیەکی دا بۆ نیکولا دەنووسێت: من بە مەرگی پوشکین وەك نووسەرێك خەمبارم) تزار بەمجۆرە وەڵای دەداتەوە: (بە تەواوی لەگەڵ بۆچوونەکەی تۆ دام، بەڕاستی دەتوانم بڵێم بە مەرگی پوشکین ئایندە مرد نەك ڕابردوو.) ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنیٚ کە ئەم تزارە، پوشکینی وەکو شاعیرێکی بەهرەمەندی تەمەن کورتی پڕ بەرهەم مەبەست نەبووە، بەڵکو داخەکەی بۆ ئەوە بووە کە پۆشکین فریا نەکەوت لە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێری پۆلیس دا و بۆ خزمەتی ڕژێمی وەخت شیعر بنووسێت. نیکولای چاوەڕوانی بەرهەمی (نیشتمانی) لە پۆشکین دەکرد، بەرهەمی لە بابەتی نمایشنامەکەی کوکولینك کە بەناوی (دەستی خوا وڵاتی ڕزگار کرد.) تەنانەت ئا. ژوکوفسکی شاعیری

خزمەتگوزاری دەرباریش زۆرزی هەوڵدا پۆشکین بێنێتە رەداو قەناعەتی پێ بکا کە پێویستە رێزی دام و دەزگای حوکمڕان بگرێ.

لە نامەیەکی دا لە ١٨٢٦/٤/١٢ دا بۆ پۆشکین دەڵێ: (وەچەی تازەی ئێمە کە لە ئاکامی پەروەردە و فێرکردنی نادروستەوە بەرانبەر بە ژیان دەستە پاچەیە، ئاشنایەتی لەگەڵ بیروبیرکردنەوەی سەرکێش و یاخی تۆدا پەیدا کردووە کە لە قاڵبی شیعری هەڵخەڵەتێنەردا خستوتە روو. تۆ جەزرەبەیەکی کوشندەت لەم وەچەیەداوە، هەق وایە بەخۆتا بچیتەوە و چیدی ئەم کارە پڕ خەتایە نەکەی. زەوق و بەهرە هیچ نییە، لوتکەی شکۆداری ئەخلاقە. — مەبەست بانگەشەیە بۆ مەبەست و مەرامەکانی رژێم ــ (وەرگێڕ)

دیارە لەوەزع و حاڵێکی ئاوادا، بەو هەموو کۆت و زنجیرەوە بەو هەموو دەرسدادانەوە، پیاو لە شکۆداری ئەخلاقی بێزار دەبێ. نەفرەت لە هەموو جۆرە (ئامانجدارییەکی) هونەر دەکا و هاوار بەسەر ئامۆژگاران و پشتیوانانادەکا:

**دوور کەونەوە! شاعیری راستی**
**تاقەت و حەسەڵەی ئێوەی نییە!**

هەڵبەتە پۆشکین ئاساییە لەو وەزع و حاڵەدا دەبوا ببێ بە لایەنگری تێوری هونەر بۆ هونەر و بە شاعیر واتە بە خۆی بڵێ: تۆ پاشایەکیت، بە تەنێ بژی، بەرێی ئازادیدا هەنگاو بنێ، بەو رێییەدا کە رۆحی مەردانەت گەشە پێدەدا، بیرە پیرۆزەکانت دەپشکوێنێ.

بێ ئەوەی لە بری کاری ئابڕومەندانەت پاداشتێ داوا بکەی. گەر، دی، پیساروف رەخنەی ئەوەم لێ بگرێ کە پۆشکینی شاعیر ئەم قسە توندانەی



بە پارێزەران و پەنادەرانی خۆ نەگوتووە، بەڵکو بە (گەل)ی گوتووە. بەڵام گەلی راستەقینە لەو سەروبەندەدا بەتەووی لە دەرێی بازنەی دیدی ئەدەبیاتی ئەو زماننە بووە، وشەی (گەل) لای پۆشکین هەمان مانای (جەماوەر) دەگەیەنێ کە زۆر جار بەکاری هێناوە. هەڵبەتە مەبەست لەم وشەیەی دوایی، جەماوەری زەحمەتکێش نییە، لە شیعری (کێوەلییەکان) دا بەمجۆرە دانیشتوانی شارە جەنجاڵەکان وسف دەکا:

**ئەوانە شەرم لە ئەشق دەکەن،**
**ئەندێشە وەدەردەنێن و ئازادی خۆ قاچاغ دەکەن،**
**لەبەردەم بتەکاندا بە چۆکا دێن**
**و پارە و کۆت و زنجیر داوا دەکەن.**

زۆر زەحمەتە ئەم خەسڵەتانە بۆ وێنە بدرێتە پاڵ سەنعەتکارانی شارەکان، لە ئەنجامی گوتەکەی سەرەوەماندا دەگەینە ئەم ئاکامە: روو کردنە تیوری (هونەر بۆ هونەر) لەو شوێنانەدا پەیدا دەبێ کە چ سازگاری و هاوئاهەنگییەك لە نێوان هونەرمەندان و ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەیاندا نەمێنێ.

دەشێت بگوترێ پۆشکین وەکو نموونە بۆ ئەم ئەنجامگیرییە بە تەنیا کافی و قەناعەت بەخش نییە، لاریم لەم قسەیە نییە، بۆیە نموونەی دی لە مێژووی ئەدەبیاتی فەرەنسا دێنمەوە، واتە نموونە لە ئەدەبیاتی وڵاتێکەوە دێنمەوە کە بەلای کەمەوە رێبازە فیکرییەکانی ئەو وڵاتە تا ناوەندی سەدەی رابردووش مایەی سەرنج و بایەخ پێدانی هەموو ئەورووپا بوو.

نووسەرە رۆمانسییەکانی فەرەنسا، ئەوانەی هاوعەسری پۆشکین بوون، تاك و تەرایان نەبێ ئید تێکڕا لە هەواداران و لایەنگرانی تێوری (هونەر بۆ هونەرش بوون.





تیوڤیل گوتیە کە رەنگە رژدترینیان بێ، بەمجۆرە گازاندە لە پەیڕەوانی هونەری ئامانجدار دەکا:

نە گەوجینە، نە گێلە پیاوانی غەبغەدار، هیچ کتێبێ شۆربایەك ناکا. ڕۆمانێك جوتێ پێڵاوی ساغ ناهێنێ. بە گیانی هەموو پاپاکانی رابوردوو و داهاتوو قەسەم، نا، دووسەد هەزار جار نا، من لەو کەسانەم کە (زاد) یان پێویستە، شت و کەسەکانم بە ڕێژەی عەکسی ئەو خزمەتەی پێم دەکەن خۆش دەوێن. هەر ئەم گوتیەیە لە نووسینێکیدا دەربارەی بودلێری خاوەنی (گوڵانی شەڕ) ستایشی بۆدلێر دەکا چونکە لایەنگر و پشتیوانی (ئازادی موتڵەقی) هونەر بووە و هەرگیز بەوە قاییل نەبووە کە شیعر جگە لە ورووژاندن و بزواندنی هەستی جوانی ناسی بە مەعنای موتڵەقی وشەی جوانی لە گیان و رۆحی خوێنەردا چ پەیامێکی دی هەبێ.

لەم بۆچونەی خوارەوەدا، دەبینین کە (فیکری جوانی) و فیکری رامیاری و کۆمەڵایەتی لە هزر و بیری گوتیەدا چەندە ناتەبا و ناکۆك بوون:

من بە قەناعەتی تەواوە ئامادەم لە پێناوی تەماشاکردنی تابلۆیەکی ڕەسەنی سەردەمی روفائیل دا یا لە پێناوی دیتنی ژنێکی جوانی رووت دا دەست بەرداری هەموو مافە مەدەنی و نەتەوەییەکانی خۆم ببم.)

توندڕەوی لەوەی پتر نابێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەموو شاعیرانی (قوتابخانەی پارناس)ی هاوبۆچوونی گوتیە بوون، ئەو پەڕەکەی چەند کەسێکی کەم نەبێ کە لەگەڵ توندڕەوی سەردەمی لاوی گوتیە سەبارەت بە (ئازادی موتڵەقی هونەر) نەبوون و رەخنەیان لێدەگرت.



ئەم جۆرە بیرو بیرکردنەوەیەی رۆمانسی و پارناسەانی فەرەنسا لە کوێوە هاتووە؟ ئایا ئەوانیش لەگەڵ ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەی خۆدا ناسازگار بوون؟

گوتیە لە ساڵی ١٨٥٧ دا لە وتارێکی دا بە بۆنەی نمایش کردنی تازەی نمایشنامەی (شاترتون)ی ڤینجی لەسەر شانۆی فەرەنسا، یادی یەکەمین نمایشی ئەم بەرهەمەی کردەوە، لەو وتارەدا دەڵێ:

پێش ئەوەی ئەو تەختەی شانۆیەی کە شاترتونی لێ وەستابوو و شیعری دەخوێندەوە پڕ بوو لە نەوجەوانانی رەنگ هەڵبزرکاوی قژ درێژ کە باوەڕی تەواویان بەوە هەبوو کە لەم جیهانەدا چ کارێکی پەسەند نیە جگە لە شیعر و نیگارکێشان.. بە رق و کینەیەکی ئەوتۆ دەیان روانیە بورژواکان کە رق و کینەی بەرپرسیارانی دانشگای (هایدلبرگ) یا (یەنا) سەبرەت بە خەڵکە عەوامەکە بە تۆزی پێیدا نەدەگەیی.)

ئەم بورژوا بێزراوانە کێ بوون؟
گوتیە وەڵام دەداتەوە کە بە نزیکە هەموو کەس هەر بورژوابوون، بانکداران، سەرافان، خاوەن نووسینگەکان، بازرگانان، خاوەن موغازەکان و..هتد، بە کورتی هەموو ئەوانەی لە هەوڵ و تەقەلای ژیان و بژێوی دا بوون.
با بێینە سەر نموونەیەکی دی:

تیودور دوبانوڤل لە تەفسیری یەکێ لە چامە ئالۆزەکانی خۆیدا دان بەوەدا دەنێ کە ئەوی بەشداری نەفرەت باران کردنی بروژواکان بووە.
لە زەمانی رۆمانسییان دا، بورژوا بە کەسێك دەگوترێ کە جگە لە پارە کۆکردنەوە و خۆ پاراستن چ ئامانج و خەمێکی دی نییە، لە شیعردا هۆنراوەی





ئاشقانەی حەز لێیە و لە هونەری نیگارکێشی دا حەزی لە دیمەنی ڕەنگاورەنگە.

دەبێ ئەوەش بگوترێ بانوڤیل داوا لە خوێنەرانی دەکا کە ئەگەر لە (چامەی پەت بازانە)دا ئەم چامەیە لە ئاخرو ئۆخری سەردەمی رومانتیزم دا بڵاو بۆوە، کەسانێکی تەنای لەبەر ئەوەی ژیانێکی بورژوانەیان هەبووە و سەریان بۆ بلیمەتانی ڕۆمانتیك دانەنواندووە بە بێ شەرەف و هیچ و پوچ لەقەڵەم دابێ، سەریان سووڕ نەمێنێ.

ئەم نموونانە بە ئاشکرا ئەوە دەسەلمێنێ کە ڕۆمانسییەکان لە گەڵ کۆمەڵگەی خۆدا ناتەبابوون و پێکەوە نەسازاون. هەڵبەتە ئەم نەگونجان و ناسازییە چ خەتەرێکی بۆ سیستەمی بورژوایی نەبوو. ئەو بورژوا لاوانەی کە دەچوونە ریزی ڕۆمانسییەکانەوە دژی سیستەمی وەخت نەدەوەستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەفرەتیان لە دزێوی لە قێزەوەری و بێ مەعنایی ژیانی بورژوایی دەکرد. ئەو هونەرە تازەیەی کە ئەواه بە شەوقەوە ڕوویان تێدەکرد، لە راستیدا بۆ ئەوان وەکو پەناگایەك بوو بۆ هەڵاتن و دوورکەوتنەوە لە ژیانی پڕ تەکەلوف و بێزارکەری بورژوایی.

لە دوا ساڵەکانی گەڕانەوەی دەسەڵاتی پاشایەتی و لە نیوەی یەکەمی سەردەمی پاشایەتی لویس فلیپ دا، وات لە گەشترین قۆناغ و سەردەمی ڕۆمانتیزمدا، لاوانی فەرەنسا نەیان دەتوانی لەگەڵ خوو خدە و مۆدۆ و مۆدبازی بۆرژوایی دا هەڵبکەن و بسازێن. بەتایبەتی لەو ڕووەوە کە فەرەنسا تازە قۆناغی تۆفانی بەسامی شۆڕشی ئازادی بەخش لە ئارادا نەما تا گەرماو تین و تاوی پێ ببەخشێ ئیدی هونەر چ چارێکی نەما جگە لەوەی بە



شێوەیەکی ئایدیالی بوونی بورژوازی نەفی بکا. ڕۆمانسییەکان نەك هەر لە ڕێگای بەرهەمەکانیانەوە بەڵکو لە ڕێگای سەرو وەزعی خۆشیانەوە هەوڵیان دەدا دژمنایەتی خوو خدە و داب و نەریتی بورژوایی بکەن. گوتیە وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. گوتی ئەو لاوانەی کە لە یەکەمین پیشاندانی نمایشنامەی شاترتون دا هۆڵەکەیان پڕ کردبوو، هەموویان سەروقژ هاتووبوون، کێ هەیە کە سەرگوزشتەی (بەلەکە) سوورەکەی هەمان گوتیەی نەبیستبێ کە خۆی لە خۆیدا بۆ خەڵکانی (سەلار و سەنگین) بە جۆرە ئابڕوچونێك دەهاتە ژماردن؟ جلوبەرگی نائاسایی و سەیر، قژی درێژ بەلای ڕۆمانسییەکانەوە هۆیەك بوو لە هۆیەکانی دژایەتی کردنی بورژوازی بێزار و هەروەها ڕەنگ زەردیش جۆرە دەربڕینێکی ناڕەزایی بوو لە بورژوایانی تێروپڕ. گوتیە دەیگوت:

(لەو سەروبەندەدا لە نێو ڕۆمانسییەکاندا ڕەنگ زەردی، سیسی و کزۆڵەیی ببوو بە مۆد، ئەم ڕەنگ زەردییە دەبووە مایەی ئەوەی کە دیمەنی سەروچاو سەرنج ڕاکێش و نا ئاسایی بنوێنێ و ئەوە بگەیەنێ کە ڕۆژگار وای تێك شکاندووە. ژنانی زەین تیژو پڕ سۆز ئەم سیمایەیان بە جوان دەزانی.)
گوتیە، ئەوەش دەڵێ کە ڕۆمانسییەکان بە تۆبزی و زۆر لە خۆکردن قەد و قەڵافاتی ڕێك و پێکی ڤیکتور هۆگۆیان پێ قووت دەچوو:

(وەختێ دەرگاکان دا دەخران و بێگانەیا تێدا نەدەما گلەیی ئەوەیان لەو بلیمەتە دەکرد کە ئەم شێك پۆشی و دەست بەخۆدا هێنانەی لە ئەنجومەنانی ئەدەبی و تەنانەت بورژوازی نزیك دەکاتەوە و ئەمەش مایەی داخە.)





جا لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە کەسانێك هەوڵ دەدەن ئەم جۆر یا ئەو جۆرە جلوبەرگە لەبەر بکەن، ئەمە بێگومان کاردانەوەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمێکی دیاری کراوە. دەکرێ لەم بارەیەوە و لە روانگەی کۆمەڵ ناسییەوە جوانترین لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێ.

لاوانی رۆمانسی بەو هەڵوێستەیانەوە دەرهەق بە بورژوازی، بێگومان دەبوایە دەرهەق بە تیوری (هونەری ئامانجدار) بئالۆزێن و رووی لێ وەرگێرن. بەلای ئەوانەوە ئامانجدار کردنی هونەر هاوتای ئەوە بوو کە هونەر بخرێتە خزمەتی هەمان بورژوازییەوە کە ئەوان ئەوەندە لێی بەداخ و بێزرا بوون. لەبەر رۆشنایی ئەمەدا دەشێ هەڵوێستی راستەوخۆ بێ پەروای گوتیە دژ بە لایەنگرانی ئامانجدار کردنی هونەر کە گوتیە ناوی (گەوج و گێلە پیاوانی غەبغەبەدار)ی لێ نابوون روون بکرێتەوە، هەروەها ئەم ناکۆکییەش روون دەبێتەوە کە بۆچی بەرای ئەو بایەخی شتەکان و ئینسانەکان رێژەیەکی پێچەوانەی هەیە لەگەڵ ئەو سوودەدا کە لەواندا هەیە. هەر هەموو ئەم هێرش و قسە ناکۆکانە هەمان مەعنای شیعرەکەی پۆشکینیان هەیە:

**دوور کەونەوە! شاعیری راستی**
**تاقەت و حەوسەڵەی ئێوەی نییە.**

پار ناسییەکان و هەوەڵێن ریالستەکانی فەرەنساش وەکو: (برایانی گنکور، فلوبیر، و هتد) بە هەمان توندی رۆمانسییەکان نەفرەتیان لەو کۆمەڵگە بورژوازییە دەکرد کە تێیدا دەژیان. ئەوانیش بۆرژوا قێزە وەرەکانیان دەدایە بەر پەلامار و تەوس و توانجی خۆ، بەرهەمەکانیان خۆیان گوتەنی بۆ جەماوەری بەربڵاو و فراوانی خوێنەران بڵاو نەدەکردەوە، بەڵکو لەبەر خاتری ژمارەیەکی هەڵبژاردە یان وەکو فلوبیر لە نامەیەکی دا دەڵێ، لەبەر خاتری



(دۆستانی نەناس) بڵاویان دەکردەوە. بەرای ئەوان تەنیا نووسەری بازاڕی دەتوانێ مایەی سەرنجی جەماوەری خوێنەران بێز (لۆکونت دولیل) باوەڕی وابوو کە سەرکەوتنی لە رادەبەدەری نووسەرێك لە نێوان جەماوەری خوێنەران دا نیشانەی نزمی بیری ئەو نووسەرەیە، ئایا ئیدی پێویست دەکا بڵێین پارناسییەکانیش وەکو رۆمانسییەکان لایەنگری تەواوی تیۆری هونەر بۆ هونەر بوون؟ هەڵبەتە نموونەی دی زۆرە بەڵام لەوەی پتر پێویست ناکا، ئا لێرەوە بە ئاشکرا دیارە کە هونەرمەندان وەختێ روو دەکەنە رێبازی هونەر بۆ هونەر کە لەگەڵ ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەی خۆدا ناەبا و نەگونجاو بن. هەڵبەتە پێویستە ئەم ناتەبایی و نەگونجانە بە وردی دیاری بکرێ.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەمدا، واتە یەکسەر لە قۆناغی پێش شۆڕشی گەورەدا، ئەو کۆمەڵە هونەرمەندە فەرەنسییەی کە هەڵگری بیری پێشڕەوانە بوون لە گەڵ کۆمەڵگەی دەسەڵاتی وەخت دا ناکۆك بوون. داڤید و جەماعەتەکەی بە دژمنانی سیستەمی کۆن دەهاتنە ژماردن. ئەم ناکۆکی و نەگونجانەش چ چارەسەرێکی نەبوو، هەڵبەتە بەو مەعنانەیە کە جۆرە سازیشێك لە نێوان سیستەمی کۆن و ئەواندا مەیسەر نەبوو. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم ناتەباییە گەلێ لەو ناتەبایی و ناکۆکیانە قووڵتر بوو کە رۆمانسییەکانی لە کۆمەڵگەی بورژوازی جودا دەکردەوە.

لە راستیدا خواستی داڤید و جەماعەتەکەی بریتی بوو لە هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆن. حالبۆکی تیوڤیل گوتیە و لایەنگرانی وەکو چۆن لەسەرێ را ئاماژەمان بۆ کردووە، چ جۆرە رقێکیان دەرهەق بە کۆمەڵگەی بورژوازیی





نەبوو، تەنیا ئەوەندەیان دەویست کە ئەم کۆمەڵگە بورژوازییە، دەست بەرداری هەندێ ڕێ و ڕەسمی قۆڕ و بازاڕی خۆ ببێ.

وەختێ داڤید و جەماعەتەکەی دژی سیستەمی کۆن هەستان دەیانزانی کە خەڵکانی چینی سێیەمیان لە پشتە، ئەو چینەی بەرەو ئەوە دەچوو، تا (سیسەیس) گوتەنی: (ببێ بە هەموو شتێ) هەست کردنی ئەوان بە ناتەبایی لەگەڵ سیستەمی وەخت د لە ڕاستیا وبە شێوەیەکی ناراستەوخۆ و پەنامەکی بریتی بوو لە پشتیوانی کردنی ئەو کۆمەڵگە نوێیەی کە لە هەناوی کۆمەڵگە کۆنەکەوە سەری هەڵدەدا و خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکرد کە جێی کۆمەڵگە کۆنەکە بگرێتەوە، بەڵام بە نیسبەت ڕۆمانسی و پاڕناسییەکانەوە دەشتێکی دیمان بەرچاو دەکەوێ، ئەوان بە هیچ جۆرێ هەواداری گۆڕانی بناخەی کۆمەڵایەتی فەرەنسای سەردەمی خۆیان نەبوون. هەر بۆیەش ناکۆکی و نەگونجانی ئەوان لە گەڵ کۆمەڵگەدا بێ ئاکام و نا ئومێدانە بوو. پۆشکینی لەمەڕ خۆشمان بە ئومێدی گۆڕانی ڕوسیای سەردەمی خۆی نەبوو، تەنانەت دەتوانرێ بگوترێ کە لەسەردەمی نیکولای یەکەمدا کەم و زۆر ئارەزووی ئەو گۆڕان و گۆڕانکارییەی نەبوو. بۆیە ڕوانینی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، جۆرە ڕەشبینیەکی گرتبووە خۆ.

پێم وایە ئێستا بتوانم ئەنجامگیریەکەی (استنتاج) پێشووی خۆم تەواو بکەم و بە ڕاشکاوی بڵێم کە:

هونەرمەندان و سەودسەرانی هونەر بۆیە ڕوو دەکەنە ڕێبازی (هونەر بۆ هونەر) چونکە ناکۆکی و ناتەباییەکی دژواری لە چارە نەهاتوو دەکەوێتە نێوان ئەوان و ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەیانەوە.



بەڵام ئەمە هەموو بابەتەکە نییە، بۆ نموونە (پیاوانی ساڵانی ١٨٦٠)ی لەمەڕ خۆمان کە باوەڕی تەواویان بەنزیك بوونەوەی سەرکەوتنی مەنتیق و ئەقڵ هەبوو، هەروەها داڤید و جەماعەتەکەی کە هەمان باوەڕیان هەبوو، ئەوەمان لا دەسەلمێنێ کە هونەری ئامانجدار، واتە ڕووکردنە کاری هونەری بەو ئیعتبارەی دادوەرییە دەربارەی دیاردەکانی ژیان) وهەروەها ئارەزووی ئەوەی کە ئەم هونەر هەمیشە لە خەباتی کۆمەڵایەتی دا بەشداری بکا، لە شوێنێك دا دێتە دی و ڕەگوریشە دا دەکوتێ کە پێوەندی و ئارەزوویەکی دوولایەنە لە نێوان بەشێکی زۆری کۆمەڵگە و هونەرمەندان و سەوداسەرانی داهێنانی هونەری پەیدا ببێ.

ئەم نموونەیەی خوارەوە دروستی و ڕاستی ئەو بۆچوونەمان بۆ دەسەلمێنێ. وەختێ تۆفانی گیانپەروەری شۆڕشی شوباتی ١٨٤٨ هەستا، گەلێ لە هونەرمەندانی فەرەنسا دەست بەرداری ڕێبازی هونەر بۆ هونەر بوون و وازیان لێ هێنا. تەنانەت بودلیریش کە گوتیە پاشتر ئەویوەکو هونەرمەندێك کە باوەڕی بتەوی بەسەر بەخۆیی ڕەهای هونەر هەبووە، ناساند، یەکسەر دەستی بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەکی شۆڕشگێڕانە بە ناوی Lesalutpublic کردبوو، هەڵبەتە ئەم ڕۆژنامەیە زوو داخرا. بەهەر حاڵ بودلێر لە ساڵی ١٨٥٢ دا پیشەکیەکی بۆ گۆرانییەکانی پییردوپونت نووسی و لەوێدا ڕێبازی هونەر بۆ هونەر بە کارێکی (منداڵانە) لە قەڵەم دەدا و دەڵێ پێویستە هونەر ئامانجێکی کۆمەڵایەتی هەبێ. پاش سەرکەوتنی ئەنتی شۆڕشەکان، بۆدلێر و ئەو هونەرمەندانەی پەیڕەوی ئەویان دەکرد، بایان دایەوە سەر تیۆری (منداڵانە)ی هونەر بۆ هونەر.

یەکێك لە هەوادارە دیارەکانی ئایندەی قوتابخانەی پارناسی ئەو رۆژگارە، واتە (لوکونت دولیل) لە پێشەکی (شیعرە کەونارا)کانی خۆیدا کە لە ساڵی ١٨٥٢ دا بڵاوبووەوە، بە جۆرێکی روون و ئاشکرا ئەم بادانەوەیەی لە روانگەی سایکولوژییەوە خستۆتوە روو.

(شیعری کە لە قاڵبی هونەردا گیرساوەتەوە) چیدی کاری قارەماننە ناهوروژێنێ، شیعر چیدی نابێ بە ئیلهام بەخشی خەسڵەتە کۆمەڵایەتییەکان، چونکە ئەو زمانە پیرۆزەی کە ئێستاکێ وکو هەموو قۆناغەکانی هەرەسی ئەدەبی، لە چوارچێوەی دەربڕینی هەستە بێ تامە شەخسییەکاندا قەتیس ماوە.. چیدی توانای ئینسان فێر کردنی نییە)

لوکونت دولیل روو دەکاتە شاعیرەکان و دەڵێ:

( ئەی شاعیران! ئیدی چیتان پێیە بیڵێن، دەتانەوێ چ شتێ فێری خەڵکی بکەن؟ ئەی مامۆستایانی تیرەی بەشەر! ئەوەتا بە چاوی خۆ دەبینن کە پەیڕەوانتان بە شێوەیەکی غەریزەی لە ئێوە زیاتر دەزانن.)

بە باوەڕێ ئەم پارناسی ئایندەیە، رۆڵی شیعر لە حاڵی حازردا (بریتیە لەوەی ژیانێکی خەیاڵی بەوانە ببەخشێ کە لە ژیانی واقیعی مەحرومن.)

ئەگەر لە روانگە سایکۆلوژیەکەوە بڕوانینە ئەم قسە قوڵانە، هەموو ئەو هۆیانەمان بۆ روون دەبێتەوە کە دەبنە مایەی پەنابردنە بەر تیۆری (هونەر بۆ هونەر) هەڵبەتە زۆر جاری دی دەگەڕێینەوە سەر ئەم پێشەکییە جوانەی لوکونت دولیل.

لە کۆتایی ئەم لایەنەی مەسەلەکەدا پێویستە ئەوە بڵێم کە هەر جۆرە دەسەڵاتێکی سیاسی بگری، لە سنووری بایەخدانی خۆیدا بە هونەر، هەمیشە



بەلای هونەری ئامانجدار دای دەشکێ. هۆی ئەمەش روون و ئاشکرایە، چونکە قازانجی ئەو دەسەڵاتە لەوەدایە کە سەر لەبەری ئایدولۆژیاکنی بخاتە خزمەتی ئامانجی خۆیەوە، چونکە دەسەڵاتی سیاسی هەر چەندە لەوەیە هەندێ جار شۆڕشگێڕانە بێ، بەڵام لە زۆربەی هەڵوێستەکاندا موحافەزەکارانەیە و تەنانەت کۆنەپەرستانەشە. بۆیە دەبینین زۆر هەڵەیە گەر دیدو بۆچونی ئامانجداری هونەر تەنیا بە دیدوبۆچونی ئەو شۆڕشگێڕانە یا بە هی ئەو کەسانە بزانین کە هەڵگری بیری پێشڕەوانەن.

مێژووی ئەدەبیای رووسیا بە ئاشکرا ئەوە نیشان دەدا کە (پارێزەرانی تاجداری ئێمە بەهیچ جۆرێ دژی ئەم بۆچوونە نەبوون. لێرەدا چەند نموونەیەك دێنمەوە لە ساڵی ١٨١٤ دا سێ بەرگی یەکەمی رۆمانەکەی ف.ف نارچنی کە ناوی (جیل بلاس) یا (بەسەرهاتەکانی شازادە گابریل سیمونوڤیچ چیستیا کوف بووو بڵاو بۆوە، ئەم رۆمانە بە فەرمانی راوزفسکی وەزیری پەروەردەی گشتی قەدەغەکرا و هەر بەو بۆنەیەوە رای خۆی لەمەڕ پێوەندییەکانی ئەدەبیات و ژیان بەمجۆرە خستە روو:

(زۆر جار وا رێدەکەوێ کە رۆماننووسان، لە کاتێکا هەوڵ دەدەن دژایەتی کەچییەکان بکەن، کەچی هێندە بەتان و پۆی دا دەچنە خوارێ و کارێکی وا دەکەن لاوان لبری ئەوەی قێز لە کەچییەکان بکەنەوە، هاوسۆزی لەگەڵ دەکەن، بایەخی ئەدەبی رۆمانێك هەرچیەك بێ، نابێ بڵاوبکرێتەوە مەگەر تەنیا لە حاڵێك دا کە ئامانجێکی ئەخلاقی هەبێ.

بەم پێیە دەبینین کە رازمفسکیش باوەڕی وابوو کە هونەر ناتوانێ بێ ئامانج بێ، ئەو دەستە خزمەتکارانەی نیکولای یەکەمیش کە پلەوپایەی پێ





بەخشراویان ناچاری دەکردن هەڵوێستێکیان لەمەڕ هونەر هەبێ، بە هەمان شێوە بیریان دەکردەوە.

ئەستروفسکیش وەختێ لە مارسی ١٨٥٠ دا شانۆنامەیەکی کۆمیدی بەناوی (هەمیشە دەکرێ لەگەڵ دۆستاندا رێك بکەوی) بڵاو کردەوە، چەند ئەدەب دۆستێکی شارەزا لە ئەدەبیات و تیجارەت، زۆر ترسان کە ئەم کۆمیدیانە زیان بە تیجارەتکاران بگەیەنێ، ئەوە بوو وەزیری پەروەردەی گشتی (شازادە شیرینسکی سییخماتوف) دەستووری بە بەرپرسیاری پەروەردەی موسکۆدا کە ئەو نووسەرە تازە کارە گاز بکا و پێی بڵێ کە:

(هونەر نابێ تەنیا ئامانجی ئەوە بێ کە شتە درێو و کەچەکان بە شێوەیەکی زیندووانە پیشان بدا. بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ خۆی لەو کارە دوور بخاتەوە و تا دەتوانێ هەستی بەرزی ئەخلاقی بڵاو بکاتەوە، بۆیە نووسەر دەبێ خەسڵەتە ئەخلاقییەکان بەرانبەر بە کەچییەکان رابگرێ، بیروکرداری بەرز رووبەرووی تەوس و توانج دابنێ، تا بەرزی بە رۆح ببەخشێ، بە کورتی نووسەر دەبێ تەئکید لەسەر بیروباوەڕێ بکا کە سوودی بۆ ژیانی گشتی و تایبەتی هەیە. تەئکید لەسەر ئەوە بکا کە کاری خراپ لەم دنیاش سزای خۆی هەیە و دەبێ تاوانکار بە سزای خۆی بگا)

نیکولای ئیمپراتۆر بەخۆیشی لە روانگە ئەخلاقییەکەوە دەیڕوانییە هونەر، وەك دەزانین هاوباوەڕی بنکندوروف بوو پێی باش بوو پۆشکین بەلای رژێم دا رابکێشرێ، نیکولا زۆر ستایشی شانۆنامەی (هەرکەس و جێی خۆی)ی ئەستڕۆفسکی دەکرد. ئیمپراتۆر نیکولای دەربارەی ئەم شانۆنامەیە دەیگوت (ئەمە هەر نمایشنامە نیە، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا دەرسێکە بۆ خۆی.)



جا بۆ ئەوەی لە گێژاوی نموونە هێنانەوەدا غەرق نەبین، تەنیا ئەم دوو راستییەی خوارەوە دەخەمە رووە و واز دێنم: (تەلەگرافی موسکۆ)ی ن. پولیڤی، بووە مایەی تورە بوونی حکومەتی نیکولای، چونکە بە خەراپی باسی نمایشنامەی (دەستی خوا وڵاتی رزگار کرد)ی کوکلینکی بوو، نەیان هێشت بڵاوبێتەوە، بەڵام وەختێ ن. پولیڤیش دەستی دایە نووسینی نمایشنامەی (نیشتمانپەروەرانە)ی وەك (بەرپرسی هێزی دەریایی روسیا) و (ئیگولکینی بازرگان) وەکو برا بوکی نووسەری ئیمپراتۆر گێڕاوێتەوە، ئەم شانۆ نامانە کردیانە کارێ کە ئیمپراتۆر بەهرەی ئەم نووسەرەی تەواو چووە دڵەوە وگوتی: (ئەم نووسەرە بەهرەیەکی بێ هاوتای هەیە، پێویستە هەر بنووسێت و بنووسێت، ئەمە کارێکە دەبێ بێکار ئەو جا بزەیەکی بۆ کرد و لەسەری رۆیی، بەڵام نابێ هەقی بەسەر گۆڤار بڵاوکردنەوەوە هەبێ!)

وا نەزانن کە سەرانی رووسیا لە خەڵکانی دی بەدەر بووبن، نەخێر، چونکە لویسی چواردە کە یەکێك بوو لە نموونە دیارەکانی زۆڵم و زۆرداری ئەویش باوەڕی تەواوی بەوە بوو کە هونەر نابێ بۆ هونەر بێ، بەڵکو دەبێ لە خزمەتی پەروەردەکردنی ئەخلاقی مرۆڤدا بێ، زۆربەی هونەر و ئەدەبیاتی سەردەمی لویسی چواردە، زۆر بە قولی ئاوێتەی ئەو بۆچوونە بوونە. هەروەها ناپلیۆنی یەکەمیش تیۆری (هونەر بۆ هونەر)ی بە یەکێك لە داهێنانە خراپەکانی ئایدولۆژیا قێزەوەرو ناپەسەندەکان دەزانی. ئەویش دەیویست ئەدەبیات و هونەر لە خزمەتی ئەخلاقی باوی سەردەمەدا بێ و تا رادەیەکیش ئەو مەبەستەی هاتە دی، چونکە زۆربەی تابلۆی هۆڵەکانی ئەو سەروبەندە گوزارشتیان لەسەرکەوتنە سوپاییەکانی ئەو دەکرد.





ناپليۆنى سێيەميش لەم بوارەدا هەمان ڕێگاى ئەوى گرتەبەر، بەڵام سەركەوتنێكى يەكجار كەمتر لەوى بەدەست هێنا. ئەويش دەيويست ئەدەبيات و هونەر بخاتە خزمەتى ئەو شتەوە كە خۆى ناوى نابوو ئەخلاق.

لە مانگى ١٨٥٢/١٠ دا دولاپرادى مامۆستاى بەنێوبانگى ليون، ئەم هەوڵ و كۆششەى پوناپارتيانەى لە پێناوى هونەرى ئامانجدار لە سەتيرێك دا بەناوى (خودايانى هونەرى دەوڵەت) ريسوا كرد. مامۆستاى نێوبراو لە نووسينەكەيدا هەواڵى ئەوەى ڕاگەياند بوو كە لە ئايندەيەكى نزيك دا خودايانى هونەرى دەوڵەت، ئەقڵى مرۆڤ ناچار دەكەن پەيڕەوى زەبت و ڕەبتێكى سوپايى بكا و بەمجۆرە ئارامى و ڕێك و پێكى بەرقەرار دەبێ و هيچ نووسەرێك زات ناكا بچووكترى ناڕەزايى دەربڕێ.

**دەبێ چ باران بێ، چ هەتاو شوكرانە بژێر بى**
**دنيا گەرم بێ يا سارد، دەبێ ڕەنگتان سوور بێ**
**من لە ڕەنگ ورووى سيسەڵە و چرچەڵە، بێزارم**
**هەركەسێ پێ نەكەنێ، دەبێ دارى تێ ببڕدرێ.**

هەڵبەتە ئەم سەتيرە پڕ مەعنايە بووە مايەى ئەوە كە دولابراد پلەى مامۆستايەتييەكەى لە دەست بدا، چونكە حكومەتى ناپليۆنى سێيەم ڕێى بەكەس نەدەدا گاڵتە بە (خودايانى هونەرى دەوڵەت) بكا.



## پەراوێزەكان

١- ئەم بۆچوونە، دووبارە كردنەوە و گەشە پێدانى هەمان بۆچوونە كە بلينسكى لە دوا ساڵەكانى ژيانى دا داكۆكى لێدەكرد، بلينسكى لە وتارێكيا بە ناوى (چاوخشاندنێك بە ئەدەبياتى ڕوسياى ساڵى ١٨٤٧) دا دەڵێ: باڵاترين و پيرۆزترين بەرژەوەندى كۆمەڵگە، بريتيە لە خۆشگوزەرانى يەكسان بۆ هەموو كەسێك. تەنيا هوشيارييە كە بەو ئاواتەمان دەگەيەنێ، هونەريش وەكو زانست دەتوانێ بەشدارى لە گەشە پێدانى ئەم هوشيارييەدا بكا، بۆيە بۆ ئەم مەبەستە زانست و هونەر. هەر دووكيان پێويستن، نە زانست دەتوانێ جێى هونەر بگرێتەو و نە هونەر دكارێ جێگرى زانست بێ) بەڵام تەنيا لە ڕێگاى (دادوەرى لەمەڕ دياردەكانى ژيانەوەيە) كە هونەر دەتوانێ ئاستى هوشيارى مرۆڤ بەرز بكاتەوە. بەمجۆرە ئەو بۆچوونەى چرنشفسكى پەروەردەى دەكا، لەگەڵ دوا دادوەرى بلينسكى دا كە دەربارەى ئەدەبياتى ڕوسياى كردووە، يەك دەگرێتەوە.

٢- ئەو نامەيەى كرامسكوى لە ١٨٨٤/٤/٣٠ دا بۆ و.و. استاسفى ناردووە ئەوە نيشان دەدا كە نووسەر تا چ ڕادەيەك لە ژێر سێبەر بيروبۆچوونى بلينسكى، گوگول، مدوتف، ئيڤانوڤ، چرنشفسكى، دابروليوبوف و پروف دا بووە.

٣- ئالفريد دوموسيە ئەم نەگونجان و نەسازانە بەمجۆرە وەسف دەكا: لەوەى بە دواوە دوو ئۆردوگا پەيدا بوو. لە لايەكەوە گيانە هاوارى لێ هەستاوو و ڕەنجاوەكان و هەموو فراوان خوازە كۆتايى نەناسەكان، چاو بەگريان سەريان دانەواند، ئەمانە خۆيان لە نێو خەونى نەخۆشى ئامێزەوە حەشار داو لەوە بەدواوە لە كەنارى ئەم ئۆقيانوسى مەرارەت و تاڵييە دا جگە لەچەند نەبجەيەكى مل بەلارەوە ناو، چ شتێكى دى بەرچاو نەدەكەوت. لەلايەكى دييەوە خەڵكانێ كە ئەهلى ژيانى مادى بوون، لە نێو لەزەتى خۆدا قيت بە پێوە وێستان و جگە لە ژماردنى پارەكانيان چ خەمێكى ديكەيان نەبوو، تەنيا هۆڕژنى گريان و قاقاى پێكەنين بوو، يەكەميان لە ڕوحەوە دەهات و دووەميان لە شەوە. (بڕوانە: دان پێدانانى يەكێك لە ڕۆڵەكانى ئەم سەدەيە.)





## بەشی دووەم

با (ئەنجومەنە) حکومەتییەکان بخەینە لاوە.

له نێو نووسەرانی ئیمپراتۆریەتی دووەم دا کەسانێك بەرچاو دەکەون، بە پێی هەندێ دید و سەرنجی تایبەتی کە بەهیچ جۆرێ پێشکەوتوخواز نەبوو، تیۆری هونەر بۆ هونەریان رەفز دەکرد، بۆ وێنە ئەلکساندر دومای بچوك زۆر بنجبڕانە دەڵێ کە زاراوەی (هونەر بۆ هونەر) جگە لە (ریزکردنی سێ وشەی بێ مەعنا) زیاتر چیدی نییە. ئەم پیاوە لە کۆمەڵە نمایشنامەی (کوڕی زۆڵ و بابی دەستبڵاو) دا هەندێ ئامانجی کۆمەڵایەتی رەچاو کردوە. بە ئەرکی خۆی دەزانی لە بەرهەمەکانیدا داکۆکی لە (کۆمەڵگای کۆن) بکا، ئەو کۆمەڵگەیەی خۆی گوتەنی لە هەموو لایەکەوە هەر لە حاڵی هەرەس و روخاندا بوو.

لامارتین له ساڵی ١٨٥٧ دا وەختێ کە باسی بەرهەمەکانی ئالفرد دوموسیەی – کە تازە مردبوو– دەکرد. زۆر بەتوندی رەخنەی لەم شاعیرە گرت، هەموو رەخنەکەشی ئەوە بوو کە ئەم شاعیرە چ جۆرە باوەڕێکی مەزەبی، کۆمەڵایەتی، سیاسی یا نیشتمان پەروەری نەبوو، هەروەها لۆحەی شاعیرەکانی سەردەمی خۆیان دەکرد کە (خۆیان بە وەزن و قافییەوە بەستۆتەوە و مەعنایان فەرامۆش کردووە.)

دوا جار پێویستە ئاورێك لە (ماکسیم دوکامپ) ش کە نووسەرێکی کەم بایەخترە، بدەینەوە. ئەمیش رەخنە لەوانە دەگرێ کە هەڵوەدای شێو و



فۆرمی روتن، لەم بارەیەوە دەڵێ:

شێوە جوانە، بەڵام وەختێ جوانە کە فیکرێکی گرتبێتە خۆ! تەوێڵی جوان کە مێشکی لە پشتەوە نەبێ بە چ دەچێ؟

لە هێرشێکی دا بۆ سەر رێبەری قوتابخانەی نیگارکێشی رومانتیك دەڵێ:
(جەنابی دولاکرواش وەکو هەندێ لەو نووسەرانەی کە مۆدی هونەری بۆ هونەریان داهێناوە، مۆدی رەنگ لە پێناوی رەنگ دای داهێناوە. مرۆڤ و مێژوو، لە روانگەی ئەوەوە جگە لە نیگارێکی پێکهاتوو لە رەنگی تێروکاڵی دەستکرد، چ شتێکی دی نەبووە.

بەرای ئەم نووسەرە (سەردەمی قوتابخانەی هونەر بۆ هونەر هەمیشە بەسەر چووە.) لامارتین و ماکسیم دوکامپش وەکو ئەلسکاندەر دومای بچوك، خاوەنی چ رێبازێکی شۆرشگێڕانە نەبوون، ئەمانە هەرچەندە تیۆری هونەر بۆ هونەریان رەفز دەکرد، بەڵام هەرگیز نەیاندەویست سیستەمێکی کۆمەڵایەتی نوێ لە جێی سیستەمی بورژوایی رۆبنەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەیانویست ئەو کۆمەڵگە بورژواییەی کە بزووتنەوەی ئازادی خوازی پرولیتاری هێنا بۆیە لەرزە، مەحکەمتر بکەن، جیاوازی ئەمانە لە گەڵ رۆمانسییەکان و بەتایبەتی لەگەڵ پارناسییەکان و یەکەم دەستەی هونەرمەندە ریالستەکاندا لەوە دایە کە ئەمان زۆر ئاسانتر خۆیان لە گەڵ ژیانی بورژوایی دا دەگونجاند. بە گوتەیەکی دی ئەمان موحافەزەکاری گەش بین بوون و ئەوان موحافەزەکاری رەش بین بوون.

بەمجۆرە دەردەکەوێ کە رێبازی هونەری ئامانجدار، هەم بۆ موحافەزەکاران دەست دەدا و هەم بۆ شۆڕشگێڕان. بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا مەرجی یەکەم و

هەرە پێویستی ئەم ڕێبازە ئەوەیە کە بۆچوونێکی زیندوو و گەشی لەمەڕ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی یا بیرێکی کۆمەڵایەتی دا هەبێ، هەر کاتێك و لەبەر هەر هۆیەك ئەو دیدوبۆچوونە لە بەین چوو، ئەم ڕێبازەش خۆ بەخۆ لە بەین دەچێ.

جا با هەنگاوێکی دی بنەین و بزانین ئەم دوو ڕێبازە ناکۆکە کامیان بۆ گەشە کردن و پەرەسەندنی هونەر لەبارترن. ئەم مەسەلەیەش وەکو مەسەلەکانی دیکەی ژیان و بیرو بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی، وەڵامی بنجبڕی نییە. چونکە هەموو شتێك بەندە بە هەلومەرجەکانی کات و شوێنەوە.

با نیکولای یەکەم و نۆکەرەکانی وەبیر خۆ بێینیەوە، ئەوانە دەیانویست پۆشکین، ئاستروفسکی و نووسەرە هاوچەرخەکانی تریان بخەنە خزمەتی ئەخلاقەوە، هەڵبەتە ئەو ئەخلاقەی کە پولیس دەیانویست، گریمان بەم مەبەستەیان دەگەیشتن، هەنگینێ چ دەهاتە پێشێ یا چی ڕووی دەدا؟ وەڵامەکەی زۆر ئاسانە: ئەو کاتە ئەو هونەرمەندانەی دەچوونە ژێر بار دەبوون بە کۆیلەی خاوەندانی هونەر، واتە جڵەوی هونەر دەکەوتە دەستی خاوەندانی دەوڵەتیانەی هونەر. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو هونەرمەندە تەسلیم بووانە خۆیان سووك دەکرد و لە حەقیقەت و توانا و خۆشەویستی خۆیان کەم دەکردەوە.

(بۆ خەتاکارانی روسیا)ی پۆشکین بەهیچ جۆرێ بە باشترین بەرهەمی ئەو ناژمێردرێ، شانۆنامەی (هەرکەسە و جێی خۆی) ئەستڕۆفسکیش کە لە کۆڕی دەسەڵاتداران بە (دەرسێکی بەسود) دەژمێردرا بەرهەمێکی سەرکەوتوو نییە، چونکە ئاستروفسکی لەو بەرهەمەیدا تەنیا چەند



هەنگاوێکی بەرەو بیرومەبەستی بنکندروفییەکان و شێخماتوفییەکان و پەیڕەوانی تری ئەم جۆرە هونەرە ئامانجدارە ناوە.

با دیسان وای دابنەین کە تیوفیل گوتیە، تیودور دوبانوڤیل، کوکونت دولیل، بودلێر، برایانی گنگور، فلوبێر و بە کورتی سەرجەم ڕۆمانسییەکان، پارناسییەکان و دەستەی یەکەمی هونەرمەندانی ریالستی فەرەنسا، لەگەڵ ژینگەی بورژوای دەوروبەری خۆدا دەسازان و بەهرەی خۆیان دەخستە خزمەتی کەسانێکەوە کە دوبانوڤیل گوتەنی ( کە جگە لە پارە کۆکردنەوە چ شتێکی دیکەیان لێ نەدەوەشایەوە) ئەنجام چۆن دەکەوتەوە؟

وەڵامەکەی ئاسانە، ڕۆمانسی، پاڕناسی و دەستەی یەکەمی هونەرمەندانی ریالستی فەرەنسا تەواو دەهاتە خوارێ وسووك دەبوون، بەرهەمەکانیان کاریگەرییەکی کەمی دەبوو، هەموو حەقیقەت و جوانییەکەی خۆی لە دەست دەدا.

(مادام بۆڤاری) فلوبێر بایەخی هونەری پترە یا (زاوای جەنابی پوئاریە)ی ئوگیر، ئێمە ئەمەمان مەبەست نییەو لێرەدا هەقمان بەسەر بەراورد کردنی بەهرەمەندی ئەو دووەوە نیە. بێ پێزی و شپرزەیی دراماتیکی ئوگیر کە لە راستیا لوتکەی خۆ سازاندنە لەگەڵ ئەتەکێت و خووخدەی بورژوایی دا توانای داهێنەرانەی جیاوازە لەتوانای داهێنەرانەی فلوبێر و برایانی گنکور و باقی دەستەی یەکەمی ریالستاندا کە بە توندی بەگژ ئەم ئەتەکێت وخووخدەی بورژواییە دا دەچوون.
لەم قسانەوە دەگەینە چ ئەنجامگیرییەك؟

دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە بایەخی هونەری هەر کارێکی هونەری لە دوا شیکردنەوەدا ناوەرۆکەکەی دیاری دەکات، ئەمە رێك ئەو مەبەستەیە کە رۆمانسییەکان– بەتایبەتی گوتیە– نەیاندەویست دانی پێدا بنەن، گوتیە دەیگوت کە شیعر نەك هیچ شتێك ناسەلمێنێ، بەڵکو هیچیش ناگێڕێتەوە، جوانی هەر دێڕە شیعرێك بەندە بە ئاهەنگ و ریتمی دێڕە شیعرەکەوە، دیارە ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و رێك پێچەوانەکەی راست و دروستە. شیعر و بە شێوەیەکی گشتی هەموو کارێکی هونەری– هەمیشە شتێك دەگێڕێتەوە، چونکە هەمیشە شتێك بەیان دەکا، هەڵبەتە جۆری (گێڕانەوەکەی) شیعر، تایەتە بە خودی شیعرەکەوە.

هونەرمەند بیرێك، دیدوبۆچوونی خۆی لە رێگەی بەڵگەی مەنتیقییەوە دەسەلمێنێ، گەر نووسەرێك لە جیاتی وێنەگرتن، پەنا بەرێتە بەر بەڵگەی مەنتیقی با ئەو وێنانە دەیانگرێ بۆ ئەو مەبەستە بێ کە ئەم یا ئەو بابەتی پێ بسەلمێنێ، ئەوا ئەو نووسەرە لە خانەی هونەرمەند دەردەچێ و دەبێ بە جاڕدەر، (مبلغ) ئیدی با نووسین و گوتارەکانی لێکۆڵینەوەش نەبن، بەڵکو رۆمان و کورتە چیرۆك و شانۆنامە بن.

دیارە ئەم روونکردنەوانە بە هیچ جۆرێ بەو مەعنایە نییە کە فیکر لەکاری هونەریدا بایەخی نییە، من لەوەش پتر دەست دادەگرم و دەڵێم چ کارێکی هونەری نییە کە بە تەواوی لە نیوەرۆکی ئیدۆلۆژی بەدەر بێ، تەنانەت ئەو نووسەرانەش کە تەنیا شێوەو فۆرمیان بەلاوە بایەخدارە و هێندە گوێ بە نیوەرۆك نادەن، بیانەوێ و نەیانەوێ بە شێوەیەك لە شێوەکان بیرێك لە بەرهەمەکانیاندا دەردەبڕن. تیوڤیل گوتیە کە گوێی بە نیوەرۆکی ئیدولۆژی



شیعرەکانی نەدەدا، وەکو دیتمان دەیگوت: ئامادەیە لە پێناوی سەیرکردنی تابلۆیەکی رەسەنی روڤایل دا یا لە پێناوی تەماشاکردنی ژنێکی جوانی رووتدا بە کەماڵی ئارەزوو دەست بەرداری سەرلەبەری مافە مەدەنی و میلییەانی خۆی ببێ.

ئەم دوو شتە بە تەواوی پێکەوە بەستراون. پابەندی ئەو بە شێوەوە، ئەنجامی ئەوەیە کە بەتەواوی مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی پشت گوێ خستبوو، وەکو پێشتر گوتم ئەو نووسەرانەی کە شێوە لە هەموو شتێکی دی بە بالاتر دەزانن هەمیشە لە بەرهەمەکانیاندا ئەو ناتەباییە لە چارە نەهاتووەی نێوان خۆیان و نێوەندە کۆمەڵایەتیەکان دەخەنە روو، ئەو فیکرە هاوبەشەی لە نێوان ئەواندا هەیە و هەر کەسەیان بە شێوەی تایبەتی خۆی دەری دەبڕی، لێرەوە سەر هەڵدەدا.

بەڵا دەربارەی ئەوەی کە هیچ بەرهەمێکی هونەری نییە کە بەتەواوی لە نیوەرۆکی ئیدولۆژی بەدەربێ، دەبێ ئەوەش بزانین کە هەموو فیکرێکیش قابیلی ئەوە نییە لە کارێکی هونەریدا دەبردرێ. روسکین ئەم بابەتەی زۆر جوان روونکردۆتەوە، رۆسکین دەڵێ کیژۆڵەیەك هەمیشە دەتوانێ ئەشقی لە دەس چووی خۆی بە گۆرانی بڵێ، بەڵا بابایەکی پیسکەی پولەکی ناتوانی گۆرانی بۆ لە دەست چوونی پارەکانی بڵێ. ئەم بۆچونەی ئەو یەکجار بە جێیە چونکە بایەخی هونەری هەر کارێکی هونەری، لەوەدایە کە ئەو هەستەی تێیدا دەردەبردرێ، بەرجەستەی دەکا.

ئەو دەڵێ دەربارەی هەر هەستێ کە زۆر کاری تێکردوی لە خۆ بپرسیت ئایا شاعیر دەتوانێ ئەو هەستە بەرجەستە بکا، ئایا ئەم هەستە دەشێت بۆ





شاعیرێك ببێ بە سەرچاوەی ئیلهام؟ گەر وەڵام ئەرێ بوو، ئەوا هەستەکە هەستێکی بەرزە، خۆ گەر وەڵام نەرێ بوو، ئەوا هەستەکە، هەستێکی نزمە. لە راستیا وایە، هونەر یەکێکە لە هۆیە مەعنەوییەکانی نزیك بوونەوەی مرۆڤ لە یەکدی، تا هەستە دەربڕاوەکانی کارێکی هونەری بەرزتر دەبێ، پتر رێ بۆ پێوەندییە مەعنەوییەکانی مرۆڤ خۆش دەکا.

بۆچی کابرای پیسکەی پولەکی ناتوانێ گۆرانی بە پارە لە دەست چووەکانیدا بڵێ؟ وەڵامەکەی ئاسانە، چونکە ئەگەر ئەمە بکا گۆرانییەکەی کار لە چ کەسێك ناکا، واتە ئەم گۆرانییە ناتوانێ هەستێکی مەعنەوی هاوبەش لە نێوان ئەو و ئەو کەسانی دیدا بوروژێنێ.

لەوەیە هەندێ شیعری جەنگیم بۆ بخوێننەوەو بڵێن چی جەنگ هۆیەکە لە هۆیەکانی نزیك خستنەوەی مرۆڤ لێکدی؟ لە وەڵامدا دەڵێم ئەو شیعرە جەنگیانەی کە لەلایەکەوە نەفرەت لە دژمن دەکا و لەلایەکی دییەوە ستایشی سەربازانی فیداکاری رێگای وڵات پارێزی دەکا، لەو سنوورەدا کە ئەم شیعرە رەنگدانەوەی ئەم جۆرە هەستەیە هەواداری خۆی هەیە و بە فاکتەرێکی پێوەندی نێوان مرۆڤ دەژمێردرێ.

ی.س. تورگنییف کە چاوی بەرای نەدەدا لایەنگرانی توندرەوی هونەری ئامانجدار ببینێ، رۆژێ گوتی کە (ڤینوس میلو لە دەستوورەکانی ١٧٨٩ کەمتر شایستەی رەفزە.) تورگینیف راست دەکا. بەڵام مەعنای حەقیقەتە چییە؟ بەهیچ جۆرێ ئەو مەعنایە نییە کە تورگینف دەیویست پێی ببەخشێ. لە گۆشەو کەناری دنیادا گەلێ کەس هەن کە نەك تەنیا لە دەستوورەکانی ١٧٨٩ دەسڵەمنەوە و رەفزی دەکەن، بەڵکو هیچی دەربارە نازانن. ئەگەر لە



کابرایەکی (هوتنتو) لە تیرەیەکە لە باشووری رۆژئاوای ئەفریقا و نیشتەجێی سەروی روباری ئارانژن) بە مەرجێ لە ئەوروپا نەی خوێند بێ، بپرسی رای دەربارەی ئەم دەستورە چیە، دەبینی تەنانەت ناویشی نەژنەوتوە، نەك هەر دەستووری ١٧٨٩ نازانێ بەڵکو کەم و زۆر ئاگای لە ڤنوس میلوش نیە، گەر ببینێ گومانی لێدەکات و رەفزی دەکا، چونکە بیرو بۆچونی تایبەتی خۆی لەمەڕ جوانی هەیە و بیری ئەو لە زۆربەی بەرهەمەکانی ڤنوس هوتنتودا رەنگی داوەتەوە. ڤنوس میلو تەنیا بۆ بەشێك لەسپی نەژادان جوان و لەبەر دڵانە، دیارە بۆ ئەم بەشە سپی نەژادە، ڤنوس میلو زۆر لە دەستووری ١٧٨٩ واقیعی ترە، بۆ؟ چونکە دەستووری ١٧٨٩ تایبەتە بە یەك قۆناغی گەشەکردنی نەژادسپیانەوە.

بەندە بەو قۆناغەوە کە بورژوازی لەپاڵ بەگژاچوونی فیودالزم دا سەرقاڵی پتەوکردن و مەحکەم کردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆی بوو، بەڵام ڤینوسی میلو بەرجەستەکردنی لوتکەی جوان خوازییەکی ژنانەیە کە بەندە بە چەندین قۆناغی ئەم گەشە کردنەوە، بە چەندین قۆناغەوە نەك بە هەموو قۆناغەکانەوە. مەسیحییەکانیش بیروبۆچوونی تایبەتیان دەربارەی جوانی ژنانە هەبوو کە بە ئاشکرا لە وێنە مەزهەبیەکانی سەردەمی بیزانسی دا دەبینرێ. ئێمە دەزانین کە لایەنگرانی ئەم وێنە پیرۆزانە، سڵیان لە جوانی ڤینوسی میلو و هەموو ڤینوسەکانی دی دەکردەو و رەفزیان دەکردن و بە (شەیتانانە) یان لە قەڵەم دەدا و هەر دەرفەتیان بۆ هەڵکەوتبا لە نێویان دەبردن. زەمان رۆیی و رۆژگار هات و (شەیتانەکانی) جاران باویان هاتەوە و بوون بە مایەی بایەخی پیاوانی سپی نەژاد. ئەم گۆڕانکارییە دوا بەدوای بزووتنەوەی رزگاری شارەکانی ئەوروپای رۆژئاوا سەری هەڵدا، هەمان





بزووتنەوەی کە بە شێوەیەکی پرشنگدار لە دەستوورەکانی ١٧٨٩ دا خۆی نواند. بۆیە دەتوانین بە پێچەوانەی تورگنیفەوە بڵێین تا دەستوورەکانی ١٧٨٩ پتر لە نێو خەڵکی ئەوروپادا بنجی دا دەکوتا، دەبوایە ڤینوسی میلو کەمتر رەفز بکرێ. ئەمە ناکۆکی نیە، بەڵکو حەقیقەتێکی سادەی مێژوویيە.
مێژووی هونەر لە سەردەمی رینسانس دا، لە روانگەی چەمکی ئەستاتیکاوە– کەوتە ژێر کاریگەری ئەم حەقیقەتەوە کە کەماڵ خوازی غەیبانی وردە وردە پاشەکشەی کرد و جێی بۆ کەماڵ خوازی زەمینی چۆل کرد. دیارە پەیدابوون و سەرهەڵدانی ئەم چەمکە، راستەوخۆ پەیوەستە بە بزووتنەوەی شارانەوە و بیرەوەری (شەیتانانە)ی سەردەمی کۆنیش یارمەتی وەدی هاتنی دا.

بلینسکیش لە ئاخروئۆخری چالاکییە ئەدەبییەکانی خۆیدا بەتەواوی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە هونەری (ناوازە) و لە هەموو مەرجێ بە دەریا–فەیلەسوفان گوتەنی– هونەری موتڵەق بوونی نییە و هەرگیزیش بوونی نەبووە، دان بەوەشدا دەنێ کە (هونەری نیگارکێشی قوتابخانەی ئیتاڵیای سەدەی شازدە تا رادەیەك لە بیری هونەری موتڵەق نزیکە) چونکە ئەم بەرهەمە هونەرییانە لەسەروبەندێکا هاتونەتە ئاراوە کە (هونەر، بابەت و مەسەلەی کۆمەڵگەی رۆشنبیر بووە) نموونەشی بۆ ئەم مەبەستە– پاکیزەکەی روفائیلە– (کە شاکاری هونەری نیگارکێشی سەدەی شازدەی ئیتاڵیایە).

بەڵام قوتابخانەکانی سەدەی شازدەی ئیتاڵیا نیشاندەری کۆتایی ململانێی دوورودرێژی نێوان موتڵەق خوازی زەمینی و موتڵەق خوازی مەسیحی– واتە غەیبانی–یە، لەسەدەی شازەدا رۆشنبیرترین چینی پایەندی هونەری موتڵەق



نکۆڵی لەوە ناکا کە پاکیزەکانی روفائیل (نۆبەرەکانی رۆفائیل– ئەگەر بشێ. وەرگێڕ) شێوە درەبرێنێکی هونەرییە کە بە چاکترین شێوە زاڵ بوونی موتڵەق خوازی زەمینی بەسەر موتڵەق خوازی غەیبانی دا دەربڕیوە و بەرجەستەی کردووە.
تەنانەت دەربارەی ئەو کۆمەڵە پاکیزەی روفائیل کە سەردەمانێك لە ژێر کارتێکردنی (لویروجین)ی مامۆستایدا کێشاونی و رواڵەتیان رەنگدانەوەی هەستێکی تەواو ئاینین هەمان قسە راست و دروستە، چونکە لە ژێر ئەم رواڵەتە ئایینەوە، شادییەکی زەمینی هێندە بەهێز نیشان دەدا کە هیچ جۆرە هاوبەشییەکی لەگەڵ پاکیزەکانی مامۆستایانی بیزانس دا نییە.

بەرهەمی مامۆستایانی سەدەی شازدەی ئیتالیاش وەکو بەرهەمی نیگارکێشانی پێش خۆیان، لە چیما بویەوە بیگرە تا دەگاتە دووچیودی بۆ ئونینسگنا، سەر بە رێبازی هونەری موتڵەق نەبوون.

لە راستیدا (هونەری موتڵەق) هەرگیز بوونی نەبووە، گەر تورگنیف، ڤینوسی میلوی بە نموونەی هونەری موتڵەق زانی بێ ئەوا لەبەر ئەوە بووە کە ئەویش وەکو هەموو ئایدیالستەکانی دی، رەوتی واقیعی گەشەکردنی ئەستاتیکای ئینسانی بە شێوەیەکی هەڵە ئامێز تەفسیر کردووە.

وەختێ موتڵەق خوازی لە ساتێکی دیاریکراودا لەکۆمەڵگە یا چینێکی دیاریکراودا رەواج پەیدا دەکا، ئەمە دیاردەیەکی بێ ریشە نیە، بەڵکو رەگوریشەیەکی دوولایەنەی هەیە، لە لایەکەوە بەندە بە مەرجە بایولۆجییەکانی گەشە کردنی بەشەرەوە کە تایبەتمەندێتی نەژادی بەگەڵ خۆی دەخا و لەلایەکی دییەوە بەنە بە مەرجەکانی پەیدابوون و ژیانی ئەم





کۆمەڵگە یا ئەو چینەوە. بۆیە ئەم موتڵەق خوازیە هەمیشە ناوەرۆکێکی ناموتڵەقی گرتۆتە خۆ، واتە لە هەلومەرج بەدەر نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەتەواوی بەهەلومەرجەوە بەندە.

لایەنگری (ئەستاتیکای موتڵەق) مەعنای دابڕان لە هەلومەرجە مێژویی کۆمەڵایەتییەکانی نیە، چونکە هەر ئەو هەلومەرجانە ئەم چێژە ئەستاتیکییە دیاری دەکەن. بەڵکو مەعنای بێ خەبەری و خۆ گێل کردنە لەو مەرجانە.
ئەم بۆچوونە سەبارەت بەرۆمانسیانی وەکو تیوفیل گوتیە دروستە، پێشتر ئەوەم روونکردەوە کە بایەخدانی تایبەتی ئەو بە شێوە و فۆرم دەگەڕێتەوە بۆ فەرامۆشکردن و پشت گوێ خستنی مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، ئەم پشتگوێ خستنە لەلایەکەوە بەرهەمەکانی لە بێ پێزی وکورت بینی و پاشڕەوی ڕێبازی بورژوایی دەپاراست و بایەخی ئەدەبیانی زیاد دەکرد و لەلایەکی دییەوە ئاسۆی بیرکردنەوەی تەنگ دەکرد و دەبوو، کۆسپ لە ڕێگەی دەرك کردنی بیروبۆچوونی پێشڕەوانەی سەردەمی خۆی و بایەخی ئەدەبی بەرهەمەکانی دێنایە خوارێ.

وا چاکە دیسان بگەڕێینەوە سەر پێشەکی کتێبی (خانم دوموپن) کە لەو پێشەکییەدا هێرشی توندو نیمچە منداڵانە کراوەتە سەر لایەنگرانی دلگەرمی هونەری ئامانجدار، گوتیە هاوار دەکا: خوایە ئەم لاف و گەزافی کەماڵ خوازییەی تیرەی بەشەر کە مێشکی ئێمەیان پێ بردووە، چەند گەوجانەیە ! لە راستیا دەڵێی مرۆڤ مەکینەیەکە و قابیلی باشتر بوونە، ئەگەر تایە خراپەکانی بگۆڕی، ئیدی دەتوانی ئاسانتر وەگەڕی بخەی.) گوتیە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە وا نییە مارشال دوپاسوم پییر بە نموونە دێنێتەوە کە قەڕابە



گەورە رەحەتی ئاساکەی بەسەلامەتی هەر سیازدە ناوچەکە بەسەرەوە دەنا و خاڵی دەکرد.

گوتیە ئەوەمان بەگوێدا دەدا کە پێشبڕکێی مەشروب خواردن لەگەڵ ئەم مارشالەدا بەهەمان ئەندازە زەحمەتە کە پێشبڕکێ لەگەڵ (میلون لوکروتونیات)ی زەمانی خۆیدا بکرێ، ئەو کابرایەی بە ژەمێك گایەکی تەواوی دەخوارد.

ئەم قسانە کە خۆیان لە خۆیاندا دروستن، دیارترین تایبەتمەندی ڕێبازی هونەر بۆ هونەرن بە پێی بۆچوونی شێلگیترین هونەرمەندانی رۆمانتیك، لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ. چ کەسانێك لە بواری بەناو کەماڵ خوازی تیرەی بەشەردا (مێشکی گوتییەیان دەبرد؟ سوسیالیستەکان، بەتایبەتی لایەنگرانی سان بسمون کە لە قۆناغێکی بەربڵابوونەوەی (خانم دوموپن) دا لە فەرنسادا لایەنگرانی زۆری هەبوو، بەم پێیە، ئەم قسانەی لە مەڕ پێشبڕکێی مەشروب خواردن لەگەڵ مارشال دوباسوم پییر و پێشبڕکێی زۆر خۆری لەگەڵ میلون لوکرو توینات دا ( کە خۆی لە خۆیدا زۆر دروستە) دژی لایەنگرانی سان سیمون بەکار هاتووە، بەڵام ئەم قسەو سەرنجانە هەرچەندە دروست بن بەڵام کە ئاراستەی لایەنگرانی سان سیمون دەکرێن زۆر نابەجێ و نادروست دەکەونەوە. کەماڵخوازی بۆ تیرەی بەشەر کە لایەنگرانی سان سیمون داوایان دەکرد چ لێکچوونێکی لەگەڵ گەدە وپڕخۆری دا نییە.

خواستی لایەنگرانی سان سیمون ئەوەبوو کە بیناوباری کۆمەڵایەتی بە قازانجی زۆربەی خەڵکی واتە بە قازانجی کرێکاران و بەرهەم هێنەران چاك بکرێ.





له قه‌ڵه‌مدانی ئه‌م بیره به گه‌وجانه و ئه‌وجا له خۆ بپرسی كه ئاخۆ وه‌دی هاتنی ئه‌م بیره توانای شه‌راب خۆری و پڕ خۆری مرۆڤ زیاد ده‌كا، ئه‌مه خۆی له‌خۆیدا هه‌مان حه‌قاره‌تی بورژواییه كه ئه‌و هه‌موو نه‌فره‌ت و كینه‌یه‌ی لای رۆمانسییه لاوه‌كان ده‌هاڕۆوژاند.

ئه‌م بابه‌ته چۆن روون ده‌كرێته‌وه؟ چۆن ئیبتزالی بورژوایی توانیویه‌تی به‌سه‌ر ئه‌نجامگیری و جیهانی بینی نووسه‌رێك دا زاڵ ببێ ك خه‌باتی بێ ئه‌مانی دژی ئاكاری نزمی بورژوایی كردبوو به ئامانجی ژیانی خۆی؟

من له سه‌رێ را، هه‌ڵبه‌ته به‌شێوه‌یه‌كی تیژ تێپه‌ڕو خێرا، له‌كاتی به‌راورد كردنی فیكری رۆمانسییه‌كان له‌گه‌ڵ داڤید و دۆسته‌كانیدا، چه‌ندین جار وه‌ڵامی ئه‌و پرسیاره‌م داوه‌ته‌وه. گوتم رۆمانسییه‌كان هه‌رچه‌نده دژی زه‌وقن و رێ و ره‌سمی بورژوایی رابووورن، به‌ڵام چ گله‌یی و گازانده‌یه‌كیان له بناغه بورژواییه‌كه‌ی كۆمه‌ڵگه نه‌بوو.

بابه شێوه‌یه‌كی وردتر له‌م بابه‌ته بتوژینه‌وه. هه‌ندێ له رۆمانسییه‌كان– بۆ وێنه جۆرج ساند له‌و سه‌روبه‌نده‌دا كه پێوه‌ندی له‌گه‌ڵ پیرولوروكس دا هه‌بوو– جۆره ته‌وه‌جوهێكی سوسیالستانه‌یان هه‌بوو. به‌ڵام ئه‌مانه كه‌مبوون، ئه‌و رۆمانسیيانه‌ی كه به شێوه‌یه‌كی گشتی دژایه‌تی ره‌فتاری درێوی بورژواییان ده‌كرد، له هه‌مان كاتدا دژایه‌تی ئه‌و سیسته‌مه سوسیالیستانه‌شیان ده‌كرد كه له پێناوی ریفورمی كۆمه‌ڵایه‌تیدا ده‌خه‌بتین. رۆمانسییه‌كان ده‌یانویست بێ ئه‌وه‌ی ده‌ستكاری بناغه‌ی كۆمه‌ڵایه‌تی بكرێ، عاده‌ت و خوو خده‌ی كۆمه‌ڵگه‌ی بگۆڕن– هه‌ڵبه‌ته ئه‌مه كارێكی مه‌حاڵه – بۆیه راپه‌ڕینی رۆمانسییه‌كان دژی بورژواكان یه‌كجار كه‌م بایه‌خ بووه.



له راستیدا ئه‌م راپه‌ڕینه له‌باری پراتیكیه‌وه به ته‌واوی بێ ئه‌سه‌ر بوو، دیاره ئه‌م كاره‌ش له بواری ئه‌ده‌بیات دا گه‌لێ ئه‌نجام و ئاكامی گرنگی به‌دوی خۆدا هێنا، ئه‌م كاره هه‌مان خه‌سڵه‌تی نا ریالستی به‌قاره‌مانی به‌رهه‌می رۆمانسییه‌كان به‌خشی كه بووه مایه‌ی هه‌ره‌س هێنانی قوتابخانه‌ی رۆمانتیزم. هه‌ڵبه‌ته خه‌سڵه‌تی خه‌یاڵی و ناریالیستی قاره‌مانی به‌رهه‌مێك له هیچ حاڵێك دا ناتوانێ بایه‌خی ئه‌ده‌بی به‌رهه‌مێك زیاد بكا. بۆیه ده‌توانین بڵێین ئه‌گه‌ر به‌رهه‌می رۆمانسییه‌كان به‌هۆی دژمنایه‌تی خاوه‌نه‌كانیانه‌وه له‌گه‌ڵ بورژواكاندا زۆر شتی به‌ده‌ست هێنا بێ، ئه‌وا به‌هۆی سوور نه‌بوونی رۆمانسیه‌كانه‌وه له‌سه‌ر ئه‌م دژمنایه‌تیه له بواری پراتێك دا زۆر شتی دی له‌ده‌ست داوه.

یه‌كه‌م ده‌سته‌ی هونه‌رمه‌ندانی ریالستی فه‌ره‌نسا، هه‌وڵیان دا له‌م كه‌موكوڕییه بنه‌ڕه‌تییه‌ی ناو به‌رهه‌می رۆمانسییه‌كان، واته له خه‌سڵه‌تی خه‌یاڵی و ناریالستی قاره‌مانانی نێوبه‌رهه‌مه‌كانیان به‌دوور بن، به‌رهه‌مه‌كانی فلۆبێر كه‌م و زۆر له‌و خه‌سڵه‌تانه‌ی تێدا نییه جگه له (سالامبو) و (چیرۆكه‌كان) هه‌وه‌ڵین هونه‌رمه‌ندانی ریالستیش دژی بۆورژواكان وێستان، به‌ڵام جۆری وه‌ستانه‌كه‌یان فه‌رقی كردبوو. ئه‌وان نه‌ده‌چوون قاره‌مانانی خه‌یاڵی به‌رانبه‌ر به بورژوای به‌دخوو دروست بكه‌ن، به‌ڵكو بورژواكانیان ده‌كرد به كه‌ره‌سته و بابه‌تی داهێنانی هونه‌ری خۆیان. فلوبێر باوه‌ڕی وابوو كه نووسه‌ر ده‌بێ له وه‌سفی ته‌بیعه‌ت و ژینگه‌ی كۆمه‌ڵایه‌تیدا هێنده واقیعی و شاره‌زابێ وه‌كو چۆن پسپۆرێكی ته‌بیعه‌ت شاره‌زای ته‌بیعه‌ته.





ئەو دەڵێ: دەبێ ئینسانەکانیش بەچاوی دایناسۆر و نەهەنگانەوە سەیر بکرێن. ئایا دەشێت لەبەردەم ساخی ئەو ددانی ئەمدا هەست بە هیچ بکرێ؟ ئەوانە نیشانبدەن، ترسناکییان بەرجەستە بکەن، بیانخەنە ناو شووشەیەك سپرتۆوە و تەواو. بەڵام لە رووی ئەخلاقییەوە مەحکومیان مەکەن. مەگەر ئێوە خۆتان وردە بۆقن؟

قارەمانانی رۆمانەکانی فلۆبێر بایەخی خۆیان،بایەخی وەسایقی خۆیان لە جیهان بینی بابەتگەریانەی فلۆبێرەوە وەرگرتووە. بابەتگەری فلۆبێر کردۆتیە کارێ کە هەر کەسێك بیەوێ بە شێوەیەکی زانستانە لە دیاردە سایکولۆژییە کۆمەڵایەتییەکان بکۆڵێتەوە ناچارە پەنایان بەرێتێ. مەوزوعیەت و بابەتگەری بەهێزترین لایەنی رێبازی فلۆبێر بوو.

هەرچەندە فلۆبێری لە بواری داهێنانی هونەریدا بەو رادەیە مەوزوعی و بابەگەری بوو، بەڵام لە بواری هەڵسەنگاندنی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆیدا هەر زاتیانە و بگرە زۆر زاتیانەش بوو. ئەویش گوتیە ئاسا تا بڵێی رقی لە بورژوا بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا بە توندی دژمنایەتی ئەو کەسانەشی دەکرد کە هەوڵی گۆڕینی بناغە و بنەمای بورژوایی کۆمەڵگەیان دەدا. ئەم دژمنایەییەی فلۆبێر گەلەك لەوەی گوتیە توندتر بوو. فلۆبێر دژمنی سەرسەختی رای گشتی بوو و بە (هەوێنی تەنگیی رۆحی بەشەری) لە قەڵەم دەدا، لەنامەیەکیدا بۆ جۆرج ساند دەڵێ:

(رای گشتی بەو شێوەیەی کە هەیە، دەکاتە زاڵ بوونی فاکتەرێك بەسەر هەموو فاکتەرەکانی دی دا، واتە زاڵ بوونی ژمارە بەسەر روح دا، بەسەر



پەروەردە و فێرکردندا، بەسەر نەژاد و تەنانەت پارەشدا، کە خۆی لە خۆیدا دەکاتە زاڵ بوون بەسەر شەرەف دا.)

لە نامەیەکی تریدا دەڵێ: رای گشتی وەکو زاراوەیەك گەلێ گەوجانەترە لە زاراوەی هەقی ئاسمانی و بەخششی خوایی. فلۆبێر کۆمەڵگەی سوسیالستی بە دێوێکی زەبەلاح دەزانی کە هەر کارێکی فەردی، هەموو جۆرە کەسایەتیەك و هەموو جۆرە بیرکردنەوەیەکی دەسرییەوە و هەموو شتێکی دەخستە ژێر چاودێری و جیهانبینی خۆیەوە و خۆی هەمووکارەکانی ئەنجام دەدا. بەمجۆرە دەبینین ئەم دژمنە سەرسەختەی بورژوایان بەهۆی نالەباری جیهان بینی خۆیەوە سەبارەت بە دیموکراسی و سوسیالیزم، بە تەواوی دەکەوێتە خانەی کۆنەپەرستانەترین بیری بورژواییەوە. ئەمە خەسڵەتی هاوبەشی سەرجەم خوازیارانی رێبازی هونەری بۆ هونەری هاو عەسری فلۆبێر بوو.

بۆدلێر کە لە مێژ بوو دەستبەرداری رۆژنامە شۆرشگێڕییەکەی ( Le salatpublic) خۆی ببوو، لە باسێکی ژیانی ئەدگار ئالن پۆدا دەڵێ: (لە نێو ئەو کەسانەدا کە دوورن لە خانەدانی، جوانپەرستی بەناچاری هەرەس دێنێ و بایەخی خۆی لەدەست دەدا و لەبەین دەچێ) لە جێییەکی دیدا دووپاتی دەکاتەوە کە تەنیا (کەشیش و سەرباز و شاعیر) شایستەی رێزلێنانن. دیارە ئەم بۆچوونە هەر بەوەوە نەوەستاوە کە موحافەزەکارانە بێ، بەڵکو بە تەواوی چۆتە خانەی بۆچوونی کۆنەپەرستانەوە.

هەمان بۆچوون و جیهانبینی لە لای (باربیە دوراڤیلی)ش هەیە. باربیە لە کتێبێکی خۆیدا بە نێوی (شاعیران) کە دێتە سەر باسی بەرهەمە





شیعرییەکانی (لوران پیشا) دەڵێ ئەو پیاوە دەیتوانی ببێ بە شاعیرێکی گەورە (چونکە لە ڕێگەی بێ دینی و دیموکراسیەوە، بێ ئایرۆیی فیکری پێ شێل دەکرد.)

ئەو دەمەی گوتیە لە ساڵی ١٨٣٥ دا پێشەکی بۆ کتێبەکەی خۆی (خانم دوموپن) نووسی، گەلێ ڕووداو، رووی دابوو، پێڕەوانی سان سیمون، کە بە گوتەی گوتیە (بە بانگەشەی کەماڵ خوازی بۆ بە شەڕ مێشکی سەریان دەبرد) بە دەنگی بەرز داوای ریفورمی کۆمەڵایەتیان دەکرد. بەڵام ئەوانیش وەکو زۆربەی سوسیال خەیاڵ پەرستەکان، باوەڕی پتەویان بە گۆڕانکاری ئاشتیانەی کۆمەڵگە هەبوو، بۆیە بە هەمان توندتیژی دژایەتی خەباتی چینایەتیان دەکرد. هەرچەندە رووی دەمی سوسیال خەیاڵپەرستەکان لە خاوەنانی هۆیەکانی بەرهەم هێنان و سەروەت و سامان بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نەبوون چینی کرێکار هەنگاوی سەربەخۆ بێ. لەگەڵ ئەوەدا کە ڕووداوەکانی ساڵی ١٨٤٨ ئەوەی نیشان دا کە ڕەنگە ئەم جۆرە هەنگاوە ببێ بە هەڕەشەیەکی پڕ مەترسی، کەچی پاش ساڵی ١٨٤٨ مەسەلەکە لەوە دەرچوو کە ئاخۆ دەوڵەمەندان ئامادەن بیری لە چاك بوونی حاڵی هەژاران بکەنەوە یا نە، بەڵکو مەسەکە بوو بەوەی کە ئەم ململانیەی نێوان دەوڵەمەندان و هەژاران چۆن دەشکێتەوە و کام لایان سەردەکەون. لە کۆمەڵگەی نوێ دا پێوەندی چینایەتی نێوان ئەم دوولایەنە زۆر سادە و ئاشکرا بەدیار کەوتبوو. تێکڕای دەمراست و تەگبیر کارانی بورژوازی پەیان بەوە بردوو کە گیروگرفتەکەیان ئەمەیە ئاخۆ کۆمەڵگەی نوێ دەتوانێ جەماوەری زەحمەتکێشان لە بازنەی کۆیلایەتی ئابوری دا بهێڵێتەوە یان



نە، دیارە ئەم بیروبیرکردنەوە تەنانەت لای موریدان و لایەنگرانی هونەر بۆ خاوەن سامانانیش چەسپی بوو.

ئەرنست رینان کە بەهۆی پایەی زانستی خۆیەوە یەکێك بوو موعتەبەرترین کەسانی سەربەم ڕێبازە، لە کتێبێکی دا بە ناوی (ریفورمی فیکری و ئەخلاقی) خوازیاری حکومەتێکی هێندە بەهێز و توانایە کە بتوانێ (وەختێ ئێمەمان لە فکران رادەچین و لە دەریای بیرکردنەوەدا نقوم دەبین، دێهاتیانی سادە و ساویلکە ناچار بکات بەشە کاری ئێمەش ئەنجام بدەن.)

دەمراست و تەگبیرکراانی بورژوازی لەجاران پتر لە مەعناو چەمکی خەبات و ململانێی نێوان بروژوازی و پرولیتاریا تێگەشتبوون، ئەمەش کارێکی گەورەی کردبووە سەربیرو بیرکردنەوەیان.

لە کتێبی (کۆمەڵگەدا) زۆر بە جێ گوتراوە کە:

(فشار و مرۆڤی ژیر شێت دەکا.)

تەگبیرکارانی بورژوا وەختێ پەیان بە مەعنا و چەمکی خەباتی نێوان چینەکەی خۆیان و پرولیتاریا برد، وردە وردە گەشبینی خۆیان سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی زانستانەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە دەست دا، ئەم کارە بە ئاشکرا بایەخی بەرهەمەکانیانی هێنایە خوارێ.

ئەگەر جاران، ئابوری سیاسی بورژوایی لە زەمینەی بیرکردنەوەی زانستی دا کەڵە نووسەری وەك دیڤید ریکاردۆی هەبوو، ئێستا هەر دیارەکانی خەڵکانی بێ توانای چەنەبازی وەك فردریك باستیاکسییە، لەبواری فەلسەفەدا پتر لەجاران پشت بەدیدی ئایدیالیستی دەبەسترا کە کرۆك و جەوهەرەکەی بریتییە لەو ڕێبازە موحافەزەکارانەیەی کە دەیەوێ تازەترین





دۆزینەوەی زانستی  تەبیعیات لەگەڵ کۆنە ڕێبازە ئاینیەکاندا بسازێنێ، بە گوتەیەی دی دەویەیٚ لابۆر و پەرشگا پێکەوە بسازێنێ.

هونەریش نەیدەتوانی لەم چارەنووسە گشتییە بەدەربێ، پاشان  دەبینن کە کاریگەری  کۆنەپەرستانەی  ئایدیالستی ئێستا، هەندێ لە نیگارکێشانی پێشڕەوی کێشاوەتەوە نێو چ گاڵتەبازاڕێکی بێ تام و بێ مەعناوە، جارێ هێندە دەڵێم کە: گیانی موحافەزەکاری— دەتوانم بڵێم گیانی تا رادەیەك کۆنەپەرستانە، هەوەڵێن هونەرمەندانی ریالست نەبووە کۆسپ لە ڕێگای ئەوەی کە ئەم هونەرمەندانە بە وردی بڕواننە ژینگەی خۆیان و کۆمەڵێ بەرهەمی هونەری بایەخدار  دابهێنن. بەڵام بێگومان  هەر ئەم گیانی موحافەزەکارییە  ئاسۆ و مەیدانی دیدی  یەکجار تەسك کردن.

ئەم هونەرمەندانە، دژمنانە پشتیان کردە بزووتنەوەی رزگاری زەمانی خۆیان و جوانترین نموونەی دەوڵەمەندی سایکۆلۆژی وەك دایناسور و نەهەنگی مایەی سەرنجی  خۆیان وەلانا. هەڵوێستی مەوزوعیان لەمەڕ ژینگە و ئەو بابەتانەی هەڵیان دەبژارد لە راسیا گەواهی بێ خەبەریانە لەو ژینگەیە.
هەڵبەتە ئەوانە نەیاندەتوانی بەهۆی گیانی موحافەزەکاریانەوە خۆشەویستی بەرانبەر بەشتێ نیشان بدەن کە بابەتی جیهان بینی تاقە کەسیان بوو، واتە بەرانبەر بە (بیرتەسکی) و (هەڵچوونی بێ تام)  کە لە (قورپولیتەی) ژیانی رۆژانەی بورژواییەوە هەڵدەقوڵا، بەڵام ساردیان  بەرانبەر ئەو بابەتانەی کە دەیانبینی و دەین خستە روو، زۆر زوو کەم ئەم کارەی لا کاڵ کردنەوە.

ئەو ناتورالیزمەی ئەوان بەردی بناغەیان لەکارە هونەرییە گرنگەکانی  خۆدا دانا،  زوو بەزوو هوسمانس گوتەنی: ( کەوتە کوێرە کۆڵانەوە) بە باوەڕی



هوسیمانس ناتورالیزم  توانای ئەوەی هەموو شتێ تەنانەت سفلیسش  بکا بەبابەتی خۆی. (هۆسیمانس لێرەدا ئاماژە بۆ کتێبی (ڤایرۆسەکانی ئەشعە)ی نووسەری  بەلچێکی تا بارانت دەکا) کەچی لەگەڵ ئەمەشدا نەیتوانی لە بزووتنەوەی کرێکاری سەردەمی خۆی تێ بگا. دروستە زۆلا کتێبی (جەرمینال) ی نووسی، بەڵام گەرچاوپۆشی لەلایەنە لاوازەکانی ئەم رۆمانەش بکەین، ئەوا نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە هەرچەندە زۆلا بە گوتەی خۆی روە و سوسیالیزم چوو، ڕێبازی ئەزمونگەری  ئەو هەرگیز ڕێی ئەوەی نەدا بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە گەورەکان بە شێوەیەکی هونەرمەندانە هەڵسەنگێنێ و بیانخاتە روو.

ئەم ڕێبازە خزمایەتی و پێوەندی نزیکی لەگەڵ ئەو جیهان بینیە مەتریالستییەدا هەبوو کە مارکس نێوی ناوە (مەتریالیزمی ناتورالستی) ئەم جۆرە مەتریالزمە  لەوە ناگات کە کار، خولیا، زەوق و خووخدەی روحی مرۆڤی کۆمەڵایەتی بە تەواوی لە ڕێگەی فیزیولوژی یا پاتولوژییەوە نایەتە روونکردنەوە، چونکە زادەی پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکانن، هونەرمەندانی سەر بەم ڕێبازە دەیان توانی (دایناسور و گیانلەبەرە لەنێو چووەکان)ی خۆیان بە شێوەی تاك هەڵسەنگێنن و بخەنە روو، بەڵام نەیان دەتوانی (گیانلەبەرە لە نێوچوەکان) لە چوارچێوەی  کۆمەڵێك دا، واتە وەکو ئەندام لەناو کۆمەڵێك دا، بدەنە بەر زەین و دیقەتی خۆ.

وەختێ هوسیمانس دەیگوت ناتورالیزم لە کوێرە کۆڵاندا  گیری خواردووە هەمان حیکایەتی (جووت بوونی ژنی بە قاڵ وشەراب فرۆشی گەڕەك) ی





دووباره دەکردەوە، بەخۆشی هەستی بەمە دەکرد (بڕوانە کتێبی لێکۆڵینەوە لە گۆڕانکاری ئەدەبی– نووسینی جولیس هوریت).

خۆ ئەم جۆرە حیکایەتە گەر وکو قوتابخانەی ریالیزمی روسی، هەندێ لایەنی پێوەندییە کۆمەلآیەتییەکانی رونکردباوە، ئەوا جێی خۆی دەکردەوە، بەلآم ریالستانی فەرەنسی بە تەواوی پێوەندییە کۆمەلآیەتییەکانیان فەرامۆش کردبوو، بۆیە تابلۆی (جووتبوونی ژنی بەقالّ و شەراب فرۆشی گەڕەك) نەك هەر جوانی خۆی لە دەست داوە، بەڵکو بووە بە شتێکی قێزەوەر و نەفرەت و رۆژێنش.

هۆسیمانس لە هەوەڵین بەرهەمەکانیا، بۆ وێنە لە رۆمانی (خوشکانی تاتار) دا ناتورالستێکی بێ غەلّ و غەش بوو، بەلآم لە داڕشتنی (حەوت گوناحی گەورە)دا (ئەمە قسەی هوسیمان خۆیەتی) تاقەتی چووە و دەستبەرداری ناتورالیزم بوو.

هوسیمانس لە رۆمانی (ئاوەژوو) دا کە لە هەندێ شوێنی دا تاقەت بەرە، رێك و بەهۆی ئەو کەموکوڕیانەوە کە تێیدایە یەکجار بە نرخە، لە قالّبی (د سەنتست دا Des esseintes) روخساری جۆرە سۆپەرمانێکی نیشان داوە– یا باشتر بڵێن دروستکردووە– (لە راستیا نموونەی خانەدانێکی تەواو بەدگۆڕاوە) بکە جۆرێ ژیانی، رێك پێچەوانەی ژیانی (شەراب فرۆش) یا (ژنی بەقالّ) دێتە بەرچاو.

ئەم جۆرە داهێنانە، جارێکی دی دروستی ئەم بۆچونەی (لوکنت دولیل) دەسەلمێنێ کە لە جێیەکدا ژیانی واقیعی نەبێ ئەوا ئەرکی شیعر دروستکردنی ژیانێکی ئایدیالییە، بەلآم ژیانی ئایدیالی (دسە سنت)



بەرادەیەك لە هەمووجۆرە ناوەرۆکێکی ئینسانی بەدەرە کە خولقاندنی چ رێیەکی بۆ دەرباز بوون لە کوێرە کۆلآنەکە نەکردەوە، هویسمنس لەوە بەدواوە رووی کردە عیرفان و خواناسی، و خواناسی مەمەرێکی (ئایدیالی) دەخستە روو بۆ دەرچوون لەو کوێرە کۆلآنەی کە چ مەفەرێکی واقیعی چاری نەدەکرد. دیارە ئەم مەفەڕە بۆ ئەو هەلومەرجە یەکجار ئاسایی بوو، بەلآم تەماشا بکەن چ ئاکامێکی بە دوی خۆدا هێناوە، هونەرمەند پاش ئەوەی بوو بە خواناس، دەستبەرداری ناوەرۆکی ئایدولۆژی خۆی نەبوو، بەڵکو رەنگێکی تایبەتی پێ بەخشی، خواناسیش بۆ خۆی فیکرێکە، بەلآم فکرێکی نامەعلوم و وەکو هەڵم و تەم بێ شێوەو کە تا دەمی مەرگ دژ بە ئەقڵ دەجەنگێ. عیرفان و خواناسی کاری هەرگێڕانەوە نییە، بەڵکو سەلماندنیشە. بەلآم ئەو شتەی دەیگێڕێتەوە (سواوە) و بۆ سەلماندنی مەبەستەکانی خۆی لە پێگەی نەفی کردنی شعوەوە هەنگاو هەڵدێنێ.

هوسیمانس بەڵگەیەکی دییە بۆ ئەمەی کە هیچ بەرهەمێکی هونەری ناشێت لە جۆرە ناوەرۆکێکی ئایدولۆژی بەدەربێ، بەلآم کە هونەرمەندێك لە گرنگترین رووداوە کۆمەلآیەتییەکانی سەردەمی خۆی نامۆ بێ، دیارە بایەخی ئەو بیرانەی کە لە بەرهەمەکانیدا بەرجەستە دەبن، تەواو دێتە خوارێ. هەڵبەتە هاتنە خوارەوەی بایەخی بیرەکانی بیەوێ و نەیەوێ لە بەرهەمەکانیشی دا رەنگ دەداتەوە. ئەم کارە لە مێژووی هونەر وئەدەبیاتدا هێندە گرنگە کە دەبێ لە هەموو لایەنەکانییەوە بخرێتە بەر وردە بینی لێکۆڵینەوەوە، بەلآم پاش ئەوەی بێینەسەر ئەم بابەتە با جارێ بزانین تا ئێستا گەیشتوینەتە کۆی و چ ئاکامێ.





رێبازی هونەر بۆ هونەر لە شوێنێك دا دێتە ئاراوەوە ریشارژۆ دەبێ کە ناسازگارییەکی لە چارە نەهاتوو بکەوێتە نێوان هونەرمەندان و ژینگەی کۆمەڵایەتیانەوە. ئەم ناسازگارییە وەختێ سوود بە داهێنانی هونەری دەگەیەنێ کە یارمەتی هونەرمەند بدا بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە ئاستێکی باڵاتر لە ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی. پۆشکینی سەردەمی نیکولای یەکەم نموونەیەکە لەم بابەتە. هەروەها رومانسی و پاڕناسی و هەوەڵین ریالستەکانی فەرەنساش لەم بابەتە نموونانەن، دیارە نموونەی دی زۆرە بۆ سەلماندنی ئەو دیاردەی کە لە هەر شوێنێك دا ئەم جۆرە نەبانی و ناسازگاری هەبووبێ، وەزع و حاڵ بە هەمان شێوە بووە.

لەگەڵ ئەمەشدا، رۆمانسی و پاڕناسی و ریالستەکان کە لە ناپەسەندی و دزێوی و کرێتی رەفتار و رێ و رەسمی ژینگەی کۆمەڵایەتی خۆیان یاخی ببوون، بە هیچ جۆرێ دژی ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتیانە نەبوون کە ئەم عادەت و رێ و رەسمە سواو ناپەسەندانەی لە گەڵ خۆدا هێنا بووە ئاراوە.
بە پێچەوانەوە لەگەرمەی نەفرەت باران کردنی بورژواکاندا بەهەمان تین و تاوەوە پابەندی (سیستەمی بورژوایی) بوون، هەڵبەت لە سەرەتادا بە شێوەیەکی عەفوی و پاشان بەوپەڕی هوشیارییەوە، لە ئەوروپای نوێدا تا بزووتنەوەی رزگاری، کە دژی بنەما بورژواییەکانی کۆمەڵگە دەخەبتی، زیاتر دەخەملێ، لایەنگرانی هونەر بۆ هونەر لە فەرەنسادا زیاتر و هوشیارانەتر خۆیان بە کۆمەڵگەی بورژواییەوە دەترساند، بە هەمان رێژەش کەمتر دەیان توانی سەبارەت بەو بیرنەی لە بەرهەمەکانی خۆیاندا دەریان دەبڕی، دوورە پەرێز بوەستن.



نابینایی ئەوان دەرهەق بەو رووداوە نوێیەی کە دەیویست هەموو ژیانی کۆمەڵایەتی نوێ بکاتەوە، دەبووە مایەی ئەوەی کە بیریان هەر بەغەڵەتی، تەسکی و یەك لایەنی بمنێتەوە و لە جێی خۆی هەنگڵە شەلێ بکا. ئاکامی ئاسایی ئەم وەزعە ئەوەبوو کە قوتابخانەی ریالیزمی فەرەنسا لە کوێرە کۆڵاندا گیرۆدە ببێ و لە جێی خۆی قەتیس بمێنێ و بۆگەن بکا، ئەو نووسەرانەش کە لە رابوردوو دا سەر بەقوتابخانەی ناتورالیزم بوون، بە لای عیرفان و خواناسی دا بابدەنەوە.

جارێکی دی دێمەوە سەر ئەم ئەنجامگیرییە، بەڵام بەر لەوەی کۆتایی پێ بێنم، حەز دەکەم سەبارەت بە پۆشکین دوو وشەی بخەمە سەر.

وەختێ (شاعر)ەکەی ئەو بەسەر (خەڵکی بێ غێرەت) دا دەبۆڵێنێ، بەڵام د.ی.پیساروف لەم بارەیەوە چ دەڵێ کەیفی خۆیەتی– چ شوێنەوارێکی بێ پێزی و بێ تامی و سواوی لە قسەکانیا بەدی ناکرێ، قسەکانی یەك پارچە غەزەب و توڕەیی دڵسۆزانەیە، شاعیر گازاندە لە خەڵکە عەوامەکە دەکا– چونکە لە راستیدا رووی دەمی لە رەشە خەڵکەکەیە نەك لەگەلی راستەقینە کە لەو سەردەمەدا بە تەواوی لە دەرێی مەیدانی دیدی ئەدەبیاتی روسیەدا بوو– کە زیاتر لە خەم و فیکری (مەنجەڵی) خۆدا بوون تا لە خەم و فیکری ئاپولون بلڤیدەر (ئاپولون بلڤیدەر: پەیکەرێکی کۆنە، لە موزەخانەی فاتیکان دایە و بەرەنگدانەوەی جوانیی پیاوانە دەژمێردرێ.

ئاماژەی نووسەر لێرەدا بۆ ئەم دێرانەی شیعر (رەمکی مەردم)ەکەی پۆشکینە: بایەخی خوداوندی بلیڤدەر لە روانگەی تۆوە بەندە بە سەنگییەوە.

**به تۆ چی، چ سودێکی تێدا نابینی**
**ئەوجاش، ئەم بەردە مەرمەڕە خوایەکە !**
**بەڵێ، چ دەڵێی؟**
**بۆ تۆ مەنجەڵێ ناهێنێ**
**هەرنەبێ خواردنەکەی تیا لێ دەنێی.**

پۆشکین دەیەوێ لەم رێگەیەوە بڵێ کە رۆحی سواو و داهێنراوی ئـەم رەشـە خەڵکەی پێ تەحەمول ناکرێ، هەر بۆیەش نایەوێ رێنوێنی جەماوەری رەشە خەڵکە بکات. چونکە چ هیوایەکی پێیـان نـەماوە، هەڵبەتـە ئـەم رەفتـارە چ شەقڵێکی کۆنەپەرستانەی نەگرتۆتە خۆ. بەڵکو جیاوازییە هەرە گەورەکەی نێوان پۆشکین و گوتیە و گوتیە ئاساکانی سەر بە رێبازی هونـەر بـۆ هونـەر لەمەدا خۆی دەنوێنێ و بەرجەستە دەبێ، جیارە ئـەم جیاوازییـەش شـتێکی نسبییە، پۆشکێن تانە لە پێڕەوانی سان سیمون نەدەدا و پێ دەچێ بە هـیچ جۆرێ ئاگای لەوان نەبووبێ، پوشکین کابرایەکی ئابڕومەندی ئازاد بوو، بەڵام ئەم پیاوە ئابڕومەندە ئازادە هەر لە منداڵی را کۆمەڵێ پێشداوەری (حـوکمی پێشـوەختە) چـینایەتی لـە لا چەسـپی بـوو، سـڕینەوەی چەوسـاندنەوەی چینایەتی بەلای ئەوەوە جۆرێك بوو لە خەیاڵ پڵاوی بێ مەعنا. ئەگەر ئاگای لەو هەنگاوە پراتکییانـە نەبایـە کـە لـە پێنـاوی نەهێشـتنی چەوسـاندنەوەی چـینایەتی دا دەنـران. بەتایبـەتی ئەگـەر بـە ئەنـدازەی هـەرواو هـەنگازەی پێڕەوانی سان سیمونی فەرەنسا دەنگی دابایەوە، ئەوا بێگومـان لـە گوتـارە توندوتیژەکانیا و لە تەنزە بە برشتەکانی دا بە تونـدی دادەبەزییـە سـەریان، هەندێ سەرنجی پۆشکین لە گوتاری ( بیرکردنەوە لە رێگە) دا کە دەربـارەی باشی وەزع و حاڵی جوتیاری رووسە لە چاو کرێکرای رۆژئاواوە— جوتیـارانی



رووس لـەو سـەردەمەدا هێشـتا لـە قۆنـاغی کۆیلەیـەتی دا دەژیـان— ئـەوە دەگەیـەنێ کـە پۆشـکینی زیـرەك و وریـا دەیتـوانی بـە هـەمان سسسـتی گوتیەوە— کە زۆر لە خوار زیرەکی پۆشکینەوە بوو— ئەنجامگیری بکا، بـەڵام باری ئابووری دواکەوتوی روسیا، پۆشکین لەو سستیە رزگار کرد.

شتێکی بەڵگە نەویستە کە وەختێ چینێك لەسـەر حیسـابی چەوسـاندنەوەی چینێکی تری لە خۆی لاواتر لەباری ئابوورییەوە، دەژی، ئەوا هەر کـاتێ ئـەو چینە لە کۆمەڵگەدا بە تەواوی زاڵ ببێ و دەسەڵات پەیکا بکا، ئیدی چـوونە پێشەوەی یەکجار زەحمەتە و دەکاتە هاوتای روخان و هـەرەس هێنـانی. ئـا لەم روانگەیەوە دەشێت هەندێ دیـاردە رون بکرێنـەوە کـە ئـەقڵی ئـەو نـەی دەبــڕین. ئایــدولۆژیای چــینی زاڵ و دەســەڵاتدرا لــە وڵاتــانی ئــابوری پاشـکەوتوودا. لــە ئاســتێکی بــاڵاترە وەك لــە ئایـدولۆژیای چــینی زاڵ و دەسەڵاتدار، لە وڵاتانی ئابوری پێشکەوتوودا.

جا رووسیای ئەمڕۆش گەییوەتە ئاستێکی گەشە کردووی ئـابوری ئـەوتۆ کـە لایەنگرانی هونەر بۆ هونـەر، بـوون بـە داکۆکـاری سیسـتەمێکی کۆمەڵایـەتی رۆنراو لەسەر بناغەی چەوساندنەوەی چینایەتی. بۆیە لەم رووەوە لـە وڵاتـی ئێمەشدا، ئێستاکێ بە ناوی (سەربەخۆیی موتڵەقی هونەروە) هەندێ شتی بێ سەروبەر دەگوترێ کە لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە تەواو کۆنەپەرستانەیە.
لە زەمانی پۆشکین دا، وەزع هێشـتا وا نـەبووە، ئەمـە زۆر بـە قـازانجی ئـەو شکایەوە.

پێشـتر گـوتم کـە هـیچ بەرهـەمێکی هونـەری نییـە کـە چ جـۆرە نـاوەرۆکێکی ئایدولوژی نەگرتبێتە خۆ، هەروەها ئەوەشم گوت کە هەموو فیکرێك ناشـێت

ببێ بە بناغە و هەوێنی کارێکی هونەری. تەنیا ئەو بیرانەی ئەندامانی تیرەی بەشەر لێکدی نزیك دەکەنەوە، دەتوانن ببن بە ئیلهامبەخشی راستەقینەی هونەرمەند، دیارە هونەرمەندەکە رادەی ئەم نزیك خستنەویە دیاری ناکات، بەڵکو ئاستی رۆشنبیری ئەو کۆمەڵگەیە دیاری دەکات کە هونەرمەندەکەی تێدا دەژی. ئەم رادەیەش لە کۆمەڵگەی چینایەتی دا بەندە بە پێوەندی نێوان چینەکان و بە ئاستی گەشەکردووی هەر یەکێك لەو چینانەوە لە ساتێکی تایبەتیدا. کاتێ بورژوازی لە پێناوی رزگاری خۆی لە نیری ئەشرافان و دەسەڵاتدارانی ئاینی، هێشتا لە حاڵی جەنگدا بوو، واتە وەختێ کە بورژوازی هێشتا بە چینێکی شۆڕشگێڕ دەژمێردرا، هەموو جەماوەری زەحمەتکێش بە دوایەوە بوون و لەگەڵ ئەودا (چینی سێیەم) یان پێك دەهێنا. ئەو کاتانە رێبەران و هەڵگرانی بورژوازی، بە رێبەری و هەڵگری بیری (هەموو میللەت جگە لە خاوەن ئیمتازان) دەژمێردران. لەو قۆناغەدا دەرفەتی نزیك خستنەوەی ئەندامانی کۆمەڵگە، کە دیارە بەرهەمی هونەرمەندانی تەبا لەگەڵ بورژوایش دا یارمەتی دەدا، تا رادەیەك زۆر بوو، بەڵام کاتێ کە بەرژەوەندی بورژوازی چیدی لەگەڵ بەرژەوەندی جەماوەری زەحمەتکێش دا نەدەگونجاو بەتایبەتی وەختێ کە بەرژەوەندی بورژوازی و پرولیتاریا تێك گیران ئیدی ئەگەر دەرفەتی ئەم نزیك خستنەوەیە یەکجار کەم بووەوە.

روسکین دەڵێ: پیاوی پیسکە ناتوان گۆرانی بۆ لە دەست دانی پارەکانی بڵێ، جا ئێستا حاڵەتی روحی بورژوازی لە حاڵەتی رۆحی ئەو پیاوە پیسکەیە دەچێ کە داخ بۆ سامنی لە دەست چووی دەخوا، بەڵام جیاوازییان لەوە دایە کە کابرای پیسکە داخ بۆ لە دەست چوونی سامانی واقیعی دەخوا،



کەچی بورژوازی لە ترسی هەڕەشەی ئایندە، ئاسوودەیی بیر و خەیاڵیشی لە دەست دەدا.

وکو گوتم: (زیەرك و فرەزان، لە ئەنجامی گوشار خستنە سەر خەڵکانی دی، بەخۆی شێت دەبێ) جا ترسی لە دەست دانی ئەم ئەگەر و دەرەفەتی گوشار خستنە سەر خەڵکانی دییش، لەوەیە بە هەمان ئەندازە زیان بە فرەزانەکە بگەیەنێ. بۆیە رێبەرانی ئایدولوژی چینی دەسەڵاتدار و حاکم، لەو کاتەدا کە ئەم چینە لە قۆناغی ئاوا بوون نزیك دەبێتەوە، ئیدی بایەخی زاتی خۆ لە دەست دەدەن. بۆیە ئەو هونەرەی کە لە ناو جەرگەی ئەم گۆڕانکارییەوە سەر هەڵدەدا بەرەو هەرەس و تەپین و داڕمان دەچێ.

لیرە بە دواوە هەوڵ دەدەم مەبەست و بابەتەکەی پێشووم تەواو بکەم و چەند نموونەیەکی هەرە گەشی نیشانەکانی ئاوابوونی ئێستای هونەری بورژوایی بخەمە بەر وردبینی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەوە.
ئێمە ئەوەمان بۆ روون بووەوە کە چۆن عیرفان و سۆفیگەری لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی فەرەنسادا سەری هەڵدا. کاتێ نووسەران دیتیان قابیل بوون بە قاڵبی بێ ناوەرۆکی خڵی لەبیر مەحاڵە، و لە هەمان کاتدا توانای ئەوەیان نەبوو لە بیروباوەڕێ مەزنی ئازادی بەخشی ئەم سەردەمە تێبگەن، ئیدی دیاردەی روکردنە عیرفان و سۆفیگەری سەری هەڵدا. بەڵام ئەو دیتن و ئەم بێ تواناییە گەلێ ئەنجامی دی بە دەمەوە بووە کە کاریگەرییان لە دابەزاندنی بایەخی زاتی کارە هونەرییەکان لە کاریگەری خودی عیرفانەکە کەمتر نەبووە.

عیرفان، دژمنی سەرسەختی ئەقڵە، بەڵام ئەو کەسەی خۆی دەداتە دەستی عیرفان و رزگاری لەعیرفاندا دەبینێ، تاقە دژمنی ئەقڵ و ژیری نییە، بەڵکو هەموو ئەو کەسانەش کە بەهەر بیانوویەکەوە بووە بەرگری و داکۆکی لە فیکرێکی هەڵە دەکەن، لە خانەی دژمنانی ئەقڵ دان، کە فیکرێکی هەڵە دەبێ بە هەوێن و بنەمای بەرهەمێکی هونەری، ئەو بەرهەمە دوچاری ناکۆکی وەها دەبێ کە راستەوخۆ زیان بە بایەخی ئەستاتیکی بەرهەمەکە دەگەیەنێ. من پێشتر وەکو نموونە ئاماژەم بۆ شانۆنامەی (لە ئاستانەی ئیمپراتۆری) دای کنوت هامسون کردوە.

قارەمانی شانۆنامەکە، نووسەرێکی لاوە بە ناوی (ئیڤارکارانۆ) ئەم قارەمانە گەرچی توانا و بەهرەیەکی پرشنگداری نییە، بەڵام پیاوێکی فشەکەر و خۆ هەڵکێشە، خۆی وەکو کابرایەکی ئازادیخواز دەخاتە روو (خاوەن بیری ئازاد، ئازاد وەکو باڵندە).

ئەم زانا ( ئازاد بیرە باڵندە ئاسایە) دەربارەی چ بابەتێك دەنوسێت؟ دەربارەی (بەرگری) دەربارەی ) نەفرەت) کێ بۆ بەرگری هان دەدا؟ دەبێ نەفرەت لە کێ بکرێ؟ دیارە دژمنایەتی پرولتاریا دەکات و دژمنانی پرولیتاریا بۆ بەرگری هان دەدا، وەعزی نەفرەت کردن لە پرولیتاریا دا دەدا. ئایا ئەم قارەمانە جۆرە نموونەیەکی تازە نییە؟ قارەمانێکە کە نموونەیمان لە ئەدەبیاتدا نەدیتوە یا زۆر کەممانن دیتوە. دیارە کەسێك دژی پرولیتاریا بوەستێ و دژمنانی پرولیتاریا هان بدات. ە ئاشکرا بانگەشەچی و جاڕ دەری بیری بورژوزاییە، ئیڤارکارانۆ بە باوەڕی خۆی و کنوت هامسونی نووسەری، شۆڕشگێڕێکی گەورەیە.



گەر سەرنجی هەوەڵێن رۆمانسیانی فەرەنسا بدەین، دەبینین هەندێ حاڵەتی روحی (شۆڕشگێڕانەیان) تێدایە کە لە چوارچێوەی موحافەزەکاری دەرناچێ، گوتیە رقی لە بورژوا بوو، بەڵام ئەمە نەدەکردە کارێ کە دژایەتی ئەو کەسانە بکات کە خوازیاری لە نێوبردنی پێوەندییە بورژواییەکانی نێو کۆمەڵگە بوون. لە راستیدا ئیڤارکارانۆ وەکو نەوەیەکی مەعنەوی ئەم نووسەرە نێودارە رۆمانسییەی فەرەنسا دێتە بەرچاو. بەڵام نەوەیەك کەلە باپیری خۆی هێوەتر چووە. ئەم بە هوشیاریەوە نەفرەت لەو شتە دەکا کە باپیری بە شێوەیەکی غەریزی دژمنایەتی دەکرد. ئەگەر رۆمانسییەکان موحافەزەکار بوون، ئەوا ئیڤارکارانۆ، کۆنەپەرستێکی خەیاڵ پڵاوی لە بابەت پۆمشچیك) درندەیە. (پومشچیك قارەمای چیرۆکێکی شچدرینە) ئەو دەیویست پرولیتاریا لە نێوبەرێ وەکو چۆن ئەم دەیویست (موجیك)ەکان لە نێوبەرێ. دیارە ئەمە خەیاڵ پڵاوێکی بێ سەروبەرە و مایە پێکەنینە، بۆیە سەرلەبەری بیرە ئازادەکانی ئیڤارکارانۆ (ئازاد وەکو باڵندە) لێرەدا دەگاتە ئەو پەڕی پوچی و بێهودەیی. ئەو وای بۆ دەچێ چینی پرولیتاریا، چینەکانی دی دەچەوسێنێتەوە. ئەم بیرە هەڵەترین بیرە (ئازادە باڵندە ئاساکان)ی ئیڤارکارانۆیە. ئەوەی مایەی داخە ئەوەیە کە پێ دەچێ کنوت هامسونش بە بیروباوەڕی هەڵەی قاەمانەکەی قاییل بێ، هەموو ئەو رووداوە ناهەموارانەی بەسەر ئیڤارکارانۆدا دێ لەووە هەڵقوڵاون کە ئینکەبەرایەتی و دژمنایەتی پرولیتاریا دەکا. بۆ نموونە هەر لەبەر ئەمەیە کە کورسی مامۆستایەتی دڵخوازی خۆی لە دەست دەدا و تەنانەت ناتوانێ کتێبەکەی خۆیشی بە چاپ بگەیەنێ. بە کورتی بە هەموو گوشارێکی ئەو بۆرژوایانە قاییلە کە تیایاندا دەژی. بەڵام لە چ گۆشەیەکی جیهاندا و لە کام وڵاتی خەیاڵی دا جۆرە

بورژواییەکی وەها هەیە کە بەمجۆرە سەرسەختانەیە، دژمنایەتی کردنی پرولیتاریا سەرکوت بکا؟ ئەم جۆرە بورژوازییە نە هەبووە و نە دەشبێ. کنوت هامسون هاتووە فیکرێکی کردووە بە هەوێن و بنەمای شانۆنامەکەی کە تەواو لە گەڵ واقیع دا ناکۆکە، ئەمەش زیانێکی ئەوتۆی لە شانۆنامەکە داوە کە ئەو لایەنانەی نووسەر ویستویەتی شەقڵی تراژیدی بداتێ، خۆ بەخۆ شەقڵی کۆمیدی وەرگرتووە.

کنوت هامسون، بەهرە و توانایەکی مەزنی هەیە، بەڵام هیچ بەهرە و توانایەك ناتوانێ ناحەقیقەت بگۆڕێ بە حەقیقەت. کەموکوڕی هەرە گەورەی درامای (لە ئاستانەی ئیمپراتۆری) دا ئەنجام و زادەی غەڵەتی فیکرە بنەڕەتییەکەیەتی. ئەم فیکرە بنەڕەتییە لەو رووەوە هەڵەیە کە نووسەر نەیتوانیوە لە مەعنای خەباتی چینایەتی کۆمەڵگەی ئەمرۆ– کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لە دراماکەی ئەودا رەنگی داوتەوە– تێ بگا.

کنوت هامسون فەرەنسی نییە، بەڵام ئەمە چ شتێك لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، (مانیڤستی حیزبی کومونیست) هەر لەو سەروبەندەدا زۆر بەجێ ئەو حەقیقەتەی دەست نیشان کردبوو کە لە وڵاتانی پێشکەوتوودا بە سایی گەشەکردنی سەرمایەدارییەوە، تەسك بینی و پەرگیری رۆژبەرۆژ لەنێو میللەتاندا زەحمەتتر دەبێ، لە کۆی ئەدەبیاتی میللی و ناوچەییەوە، ئەدەبیاتی جیهانی دێتە ئاراوە.

راستە کنوت هامسون لە وڵاتێکی ئەورووپای رۆژئاوادا لە دایك بووە و ژیاوە، بەڵام وڵاتەکەی لە رووی پێشکەوتی ئابوورییەوە لە وڵاتە زۆر پێشکەوتووەکان نەبووە. ئاشکرایە ئەمە کردویەتێ کاری کە لە هەندێ بەشی



دراماکەیدا زۆر ساکارانە و منداڵانە کەوتۆتە بەرجەستەکردنی وەزع و حاڵی پرولیتاریای خەباتگێڕ لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی ئەمرۆدا، بەڵام سەرەڕای پاشکەوتووی ئابوری وڵاتەکەی، ئەوجاش بە هەمان نەفەسی رۆشنبیرانی بورژوازی، پێشکەوتوترین وڵاتەوە بەربەرەکانی و دژایەتی چینی پرولیتاری کردووە.

ئیڤارکارانۆ، تەنیا لایەنێکە لە لایەنەکانی شەخسیەتی نیتشەیی. نیشتەیزم چییە؟ نوسخەیەکە لەو خەباتەی کە بە ناو دژی (بورژوکانە) و لە هەمان کاتدا سوورە لەسەر پاراستنی سیستەمی بورژوای کۆمەڵگە، ئەم نوسخە تازەیەش بە پێی پێداویستیەکانی قۆناغەکانی ئەم دواییەی سەرمایەداری دەستکاری کراوە.

زۆر بە ئاسانی دەکرێ نموونەیەکی دی لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی فەرەنسی، بخرێتە بەرچاو.

یەکێك لە شانۆنامەنووسە هەرە بە تواناکانی ئێستای فەرەنسا– بەتایبەتی کە بۆ ئێرە مەبەستمانە– و دەوڵەمەندترینیان لە رووی فکرەوە، ئەوا بێ چەندو چون فرانسوا دوگورولە.

(خۆراکی شێر) شانۆنامەیەکی (٥) پەردەیی دوگورولە لە هەموو شانۆنامەکانی تری بەرچاوترە. ئەم شانۆنامەیە– هێندەی من پێ بزانم– کەمتر سەرنجی رەخنەگرانی روسی راکێشاوە.

جان دوسانسی کاراکتەری سەرەکی شانۆنامەکە، لە ئەنجامی هەندێ رووداوی سەردەمی منداڵی خۆی، بۆ ماوەیەکی کورت روو دەکاتە سوسیالیزمی مەسیحی. بەڵام پاشان لەم سوسیالیزمەش دادەبڕێ و دەبێ بە لایەنگری

ئاشكرای بەرهەمهێنانی سەرمایەداری. لە دیمەنی سێیەمی پەردەی چوارەم دا خوتبەیەكی گرنگ دەدا تا ئەوە بە كرێكاران نیشان بدا كە:

(خو ویستی جمكانەی بەرهەمهێنان بۆ زەحمەتكێشان، وەكو بەزەیی جمكانەی بەخششە بۆ هەژاران، واتە یەك سەرچاوەی خێرن.)

كە مقۆ مقۆ دەكەوێتە نێو گوێگرەكانی، ئەویش بەرە بەرە گەرم دەبێ و بە بەراوردێكی جوان و پرشنگدار نەخش و ڕۆڵی سەرمایەدار و كرێكار لە بواری بەرهەم هێننی مودرندا شەرح دەكا.

( وەختێ شێر لە قولایی بیابانەوە دەنەڕێنێ و كاتێ چوونە راوی خۆی رادەگەیەنێ، چەقەڵ پۆل پۆل وەدەر دەكەون تا پاشماوەی نیچیرانی ئەویان پێ ببڕێ. ئەوان كە نە توانای پەلاماردانی گایان هەیە و نە بە تۆزی پێی ئاسك دا دەگەن، چاوی هیواو ئومێد دەبڕنە چنگ و پەلی پاشا. حاڵی عەرزم هەن، چنگ و پەلی پاشا ! پاشا دەمەو ئێوارێ لەلان دێتەدرێ و دەچێتە راوێ. نیچیر بە دیار دەكەوێ! لەپڕ پەلامارێكی پەڕچووئاسا، شەڕێكی دژوار و خوێناوی، ها لێرە، ها لەوێ، ئەوجا مەرگ،  پاشان زیافەتێكی شاهانە بەبەر چاوی پر ئیحترامی چەقەڵانەوە. وختێ كە شێر تێر بوو، چەقەڵان شیو دەخۆن. پێتان وایە ئەگەر شێرەكە نێچیرەكەی خۆی بەسەر میوانەكانیدا دابەش كردبا و خۆی بە پارچە گۆشتێكی بچوك قەناعەتی كردبا، میوانەكان خواردنێكی چاكترین پێ دەبڕا؟ بە هیچ جۆرێ.... چونكە شێر وا ئارام و ساڵحان هەنگینێ لە شێرایەتی دەكەوت و ناوی شێر نەدەبوو. ئەو پەڕەكەی“ ئەو پەڕەكەی سەگێك دەبوو كە هاوڕیەتی كوێرێك بكا ! چونكە شێری وا لەگەڵ یەكەم پاڕانەوەی ترسدا، دەست لە كوشتن هەڵدەگرێ ودەكەوێتە



لستنەوە و تیماركردنی زامی نێچیرەكەی. ئێوە باسی جانەوەرێكی خوێنخۆر، بە توانا و دەسەڵات، كە جگە لە كوشتار چ شتێكی دی لەبیر نەبێ، بۆ من بكەن. وەختێ ئەم جۆرە جانەوەرە دەنەڕێنێ ئاو دەزێتە زاری چەقەڵان هەر ئەم خەتیبە رونبێژە، لەم قسە كورتانەی خوارەوەیدا و بە هەمان رەوانی پێشوو، لەسەر بەراوردە ئاشكراكەی خۆی دەڕوا: (پیشەسازی كۆمەڵێ سەرچاوەی رزق دێنێتە ئاراوە كە كرێكار لە هەموو كەس پتری لە دەبا.)
من چاك دەزانم كە نووسەر، بەرپرسیاری ئەو قسانە نییە كە قارەمانانی نێو كتێبەكەی دەیكەن.

بەڵام لە زۆر شوێنا نووسەر هاتووە و بیر و باوەڕی خۆی دەربارەی ئەم قسانە دەربڕیوە، دیارە ئەمەش ڕێی ئەوەمان بۆ خۆش دەكا كە حوكم لەسەر بیروباوەڕی نووسەرەكەش بدەین. بەڵام سەر لەبەری  شانۆنامەی (خۆراكی شێر) ئەوە نیشان دەدا كە گورول وەختێ پیشەسازی بە شێر، و كرێكاران بە چەقەڵ دەشوبهێنێ، تەواو هاوڕای جان دوسانسییە. هەموو شتێك ئەوە دەسەلمێنێ كە ئەویش بەوپەڕی متمانەوە دەتوانێ هەمان قسەكانی قارەمانانی شانۆنامەكەی بڵێتەوە:( من باوەڕم بە شێر هەیە، من رێزم بۆ ئەو ماف و  دەستكەوتانە هەیە كە شێر بە زەبری چنگ و پەلی خۆی وەدستی دێنێ) هەروەها ئامادەیە كرێكاران بەو چەقەڵانە بشوبهێنێ كە پاشماوەی سەرمایەداران دەخۆن. ئەویش وەكو جان دوسانسی خەباتی كرێكاران دژی سەرمایەداران وەكو خەباتی چەقەڵانی  عەزرەتی دژ بە شێری توانا، سەیر دەكا. ئەم بەراوردە بیری بنەڕەتی شانۆنامەكەی ئەو پێك دێنێ و هەمان بیر چارەنووسی قارەمانە سەرەكییەكەی ئەو دیاری دەكات.

بەڵام ئەم بیرە، بە ئەندازەی نووکە دەرزییەك حەقیقەتی تێدا نییە. ئەم بیرە مەعنای حەقیقی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگەی هاوچەرخ گەلێك لە سەفسەتە ئابورییەکانی باستیاف و لایەنگرە زۆرو زەبەندەکانی – بە بوهم– باوەڕەکەوە– دەشێوێنێ. لە راستیدا چەقەڵا هیچ هەوڵێك نادەن بۆ دۆزینەوە و پەیداکردنی خۆراکی شێر لە حاڵێکا کە ئەوانیش لێی دەخۆن و تا رادەیەك برسێتی خۆیانی پێ دەشکێنن. بەڵام کێ دەتوانێ بڵێ کە کرێکارانی کارگەیەك بە هیچ جۆرێ بەشداری بەرهەم هێنان ناکەن؟ سەفسەتە ئابوریەکانی هەرچییەك بن، ئەوا چ گومانێك لەوەدا نییە کە ئەم بەرهەمە، بەرەی رەنجی کرێکارانە، ئاشکرایە خاوەن کاریش، وەکو بەڕێوەبەر و رێکخەر بەشداری بەرهەم هێنان دەکا. وەکو بەڕێوەبەرایەتی و رێکخەر ئەویش بەشێکە لە کرێکاران. بەڵام هەموو دەزانن کە کرێ و هەق دەستی بەڕێوەبەری کارخانە شتێکە و سوود و قازانجی خاوەن کارخانە شتێکی دییە، وەختێ ئەو کرێ و هەقدەستە لەم سوود و قازانجە دەردەکرێ، شتێك دەمێنێتەوە بە ناوی سەرمایەوە. هەموو مەسەلەکە لەمەدایە کە بزانین بۆ ئەوەی دەمێنێتەوە، دەخرێتە سەرسەرمایە. دیارە لە وڕێنە رەوان و بێ گرێکنی جان دوسانسی دا کەمترین بچوکترین وەڵامی ئەم پرسیارەمان چنگ ناکەوێ. ئەو تەنانەت هەست بەوەش ناکا کە دەرامەتەکەی وەکو خاوەن بەشێکی گەورەی کارخانە، بە هیچ جۆرێ قابیلی پەردەپۆشی نییە– تەنانەت ئەگەر چواندنە تەواو نادروستەکەی، خاون کار بە شێرو کرێکار بە چەقەڵیش دروست بووبێ، چونکە ئەو هیچ جۆرە کارێك لەم کارخانەیەدا ناکات و کەچی ساڵانە دەرامەتێکی شایستەی پێ دەبڕێ.
گەر کەسێك لە چەقەڵ بچێ و لەسەر بەرهەم و کار و کۆششی کەسێکی دی



بژی، ئەوا ئەو کەسە دەکاتە ئەو سەهمدارەی کە هەموو کارەکەی بریبیتیە لە چاودێری سەهمەکەی خۆی و دەبێ بە جاڕدەری رژێمی بورژوایی کە ئەویش لە بەرهەم هێناندا بەشداری ناکات، بەڵام ورتکە خۆری سە سفرەی بەشکۆی سەرمایەیە.

بەداخەوە، گورول بە هەموو بەهرە و توانایەکییەوە، لە خانەی ئەم جۆرە جارچییانەدا دەگیرسێتەوە، گورول لە خەباتی نێوان کرێکاران و سەرمایەداراندا بە تەواوەتی لە ریزی سەرمایەداراندایە و وێنە و چەمکێکی تەواو هەڵە لەمەڕ پێوەندییە حەقیقییەکانی نێوان چەوساوان و چەوسێنەران، دەخاتە روو.

ئەدی شانۆنامەی (سەنگەر)ی بورجیت چییە؟ ئەم شانۆنامەیە بریتی لە پەیامێك کە ئەم نووسەرە نێودارە بە توانایە بۆ بورژوازی دەنێرێ و داوای لێدەکا تا یەك بگرن و دژایەتی پرولیتاریا بکەن. واتە هونەری بورژوایی زاڵ کردووە. دیارە نوێنەرانی ئەم جۆرە هونەرە چیدی ئەو مافەیان نییە کە بڵێن ئێمە بۆ (هەراو هەنگامە و ئاژاوەی ژیان و خەبات) نەخولڵاوین. بە پێچەوانەوە، ئەوانە خۆیان بە دووی خەبات و ململانێدا دەگەڕێن و چ ترسێکیان لە هەراو ئاژاوەی زادەی ئەم خەبات و ململانێیە نییە. بەڵام ئەو خەباتەی کە ئەوان دەیانەوێ بەشداری تێدا بکەن، لە پێناوی چیدایە؟ مەخابن! لە پێناوی (بەرژەوەندی) دایە. هەڵبەتە لە پێناوی بەرژەوەندی شەخسی دا نییە. چونکە ماقوڵ نییە بڵێین خەڵکانی وەکو گورول وبورجێت لە پێناوی دەستکەوتی شەخسی دا بەرگری و داکۆکی لەسەرمایە دەکەن. ئەو بەرژەوەندییەی کە ئەوان داکۆکی لێدەکەن، بەرژەوەندی چینێکی





کۆمەڵایەتییە. دیارە ئەمەش جۆرە بەرژەوەندییەکە، جا با بزانین کە ئەگەر ئەم قسەیە دروست بێ، بە کوێمان دەگەیەنێ.

رۆمانسیەکان، لەبەرچی (بورژواکان)ی سەردەمی خۆیان دەبوغزاند؟ ئەوان، دوبانوڤیل گوتەنی بۆیە بورژواکانیان دەبوغزاند چونکە بورژواکان جگە لە پارە پەرستی چ ئاینێکیتریان نەبوو.

ئەدی نووسەرانی وەك: گورول، بورجیت و هامسون لە بەرهەمەکانیانیدا داکۆکی لە چی دەکەن؟ داکۆکی لەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە دەکەن کە زۆرترین پارە بۆ بورژوازی دابین و مسۆگەر دەکا. ئیدی بزانە ئەم نووسەرانە تا چ رادەیەك لە رۆمانسییەکانی زەمانی کۆن دوورکەوتونەتەوە! چ شتێك ئەم دوورکەوتنەوەیەی هێناوەتە ئاراوە؟ چ شتێك نییە، تەنیا پرۆسەی حەتمی گەشە کردنی کۆمەڵایەتی نەبێ. تا ناکۆکییە تایبەتییەکانی ناوەوەی جیهانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری تیژتر دەبوو، هونەرمەندانی وەفاداری بیی بورژوایی زەحمەتتر دەیانتوانی بە پێی تیوری هونەر بۆ هونەر کار بکەن و لە بورجی عاجیدا بمێننەوە.

پێ ناچێ لە دنیای ژیاری ئەمرۆدا، وڵاتێك هەبێ کە لاوەکانی، سەوداسەری بیرەکانی فردرێك نیشتە نەبووبن، گەر تیوفیل گوتیە، بورژواکانی زەمانی خۆی دەبوغزاند، ئەوا فردیك نیشتە زۆر لەو زیاتر هاوعەسرانی (خەولێکەوتو)ی خۆی دەبوغزاند، نیشتە چ رەخنە و ئیرادێکی لێ دەگرتن؟ کەموکوڕی سەرەکییانە– کە سەرچاوەی کەموکورییەکانی تریشیان بوو– چیبوو؟ نیشتە رەخنەی لە هاوعەسرانی (خەولێکەوتوو)ی خۆی دەگرت کە ناتوانن وەکو خەڵکی شایستە و باڵای ناو کۆمەڵگە، بیر بکەنەوە، هەست



بکەن و کار بکەن، بۆ هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ئەو دەمە، ئەم رەخنەیە ئەوە دەگەیەنێ کە بۆ بەرگری لە سیستەمی بورژوایی و بەرەنگار بوونەوەی پەلاماری شۆڕشگێڕانەی پرولیتاریا، هێز و شێلگیری پێویست بەکار نەدەهێنرا. هەموومان کین و رقی نیشتەمان دەرهەق بە سیوسالستەکان لەبیرە.

با جارێکی دی ئەنجامی ئەم قسانە هەڵسەنگێنینەوە.

ئەگەر پۆشکین و رۆمانسییە هاوچەرخەکانی ئەو رەخنەی ئەوەیان لە (خەڵکی) دەگرت کە لە پێویست زیاتر لە خەمی خۆشگوزەرانی خۆ دابوون ( یا لەخەمی مەنجەڵی خۆدا بوون) ئەوا نیو رۆمانسیەکانی ئێستا بە پێچەوانەوە گلەیی ئەوە لە خەڵکی دەکەن کە سست و دەستەوستانن و وەکو پێویست بەرگری لە مەنجەڵی خۆ ناکەن، واتە قەدری نازانن. وێڕای ئەمەش نو رۆمانسییەکانی وەکو رۆمانسیەکانی رابوردوو دەم لەسەربەخۆیی موتڵەقی هونەر دەکوتن. بەڵام ئایا دەشێت بە شێوەیەکی جدیانە دەم لەسەر بەخۆیی موتڵەقی هونەرێك بکوترێ کە حزمەتی هێندەی پێوەندی کۆمەڵایەتی کردبێ بە ئامانجی خۆی؟ هەڵبەتە نە! بێگومان ئەم جۆرە هونەرە خۆی لە خۆیدا ئامانجدارە و بەهەڵە ناوی هونەر بۆ هونەری بەسەردابڕاوە. حەقیقەتەکە ئەوەیە کە بەرای ئەوان– دیارە لێرەدا مەبەستم بەرژەوەندی شەخسی نییە، چونکە یەکێك دڵسۆزی هونەری خۆی بێ، بەرژەوەندی شەخسی زۆر لە لا مەبەست نییە– ئەوەی قابیلی بوغزاندنە ئەو سەرنج و بۆچونانەیە کە بەرژەوەندی (زۆربەی چەوساوان) رەچاو دەکا. کە چی بەلای ئەوانەوە بەرژەوەندی (کەمایەتییە چەوسێنەرەکە) بالاترین یاسایە، بەمجۆرە دەبینین کنوت هامسون یان فرانسوا دوگورول لە بارەی





ئامانجداری هونەرەوە، جیهانبینی و روانینێکی تەواو پێچەوانەی روانینی جیهانبینی تویفیل گوتیە یا فلوبیریان هەیە. وەکو دەبینین ئەمانیش لە هەندێ پێشداوەری موحافەزەکارانە بە دەر نین، بەڵام لەسەردەمی گوتیە و فلوبیر بەملاوە ناکۆککیە کۆمەڵایەتییەکان قوڵتر بوونەوە و ئەم پێشداوەریانە بە جۆرێك لە نێو هونەرمەندانی لایەنگری بورژوازی بڵاو بۆوە کە زۆر زەحمەتە کەسێك هەبێ و بتوانێ راستگۆیانە پەیڕەوی تیۆری هونەر بۆ هونەر بکات.

هەڵبەتە مەبەستمان ئەوە نییە هەر هیچ کەسێك نییە بتوانێ شێلگیرانە پێڕەوی ئەم تیۆریە بکات، بەڵکو ئێستا بە بەڵگەوە ئەوە نیشان دەدەین کە ئەم کارە لە سەردەمی ئەمڕۆی ئێمەدا یەکجار زەحمەتە و قورس دەکەوێتەوە.

تۆ رۆمانسییەکان حەز دەکەن باوەڕ بە خوێندن کە لەسەروی (چاکە و خراپە)وەن. دیارە ئەمەش کاریگەری نیشتەیە. بەڵام سەروی (چاکە و خراپە) دەکاتە چی و چ دەگەیەنێ! ئەوە دەگەیەنێ کە بەرهەمی مەزنی مێژوویی ئەوتۆ بنووسن کە بە چەمك و پێوەری چاکە وخراپە نەیەتە هەڵسەنگاندن، واتە بە پێوەر و چەمکانەی کە لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دیاری کراوەوە پەیدا بوون، نەیەتە هەڵسەنگاندن. پیاوانی شۆڕشگێڕی فەرەنسای ساڵی ١٧٩٣ لە خەباتی خۆدا دژی کۆنەپەرستی، بێ چەند و چون کەوتبوونە سەرووی چاکە وخراپەوە. چونکە کارەکەی ئەوان تەواو ناکۆك بوو لەگەڵ چەمکی چاکە و خراپەی زادەی سیستەمی کۆمەڵایەت کۆن. هەرچەندە ئەم ناکۆکییە هەمیشە پڕ ئازار و بە سوێیە، ئەوجاش قابیلی



چاوپۆشی نییە تەنیا ئەو کاتە نەبێ کە ئەنجامی کاری ئەوە مرۆڤە شۆڕشگێڕانە– کە ناچارن بۆ ماوەیەکی دیاریکراو خۆ بخەنە سەرووی چاکە و خراپەوە– بەریتی بێ لە رامالینی خراپە لەبەردەم چاکە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا. بۆ گرتنی زیندانی باستیل دەبوا شەڕ لەگەڵ پاسەوانانی زیندانەکەدا بکرێ. ئەم شەڕە دەکاتە خۆ دانان بە شێوەیەکی لە سەرووی چاکە و خراپەوە، لەو سنوورەدا کە گرتنی باستیل کۆتایی بەسەرە رۆیی ئەو کەسانە دێنا کە خەڵکیان زیندانی دەکرد، چونکە پاشایانی زاڵم گوتەنی ( حەزیان دەکرد) لە ژیانی کۆمەڵایەتی فەرەنسادا چاکە پیادە بکەن و خراپە نەهێڵن. بۆیە ئەمە پاساوی رەفتاری ئەو کەسانە بوون کە لە پێناوی رامالینی ئەم سەرەرۆییەدا ، خۆیان لە سەرووی چاکە و خراپەوە دادەنا.

بەڵام هەموو ئەو کەسانەی کە خۆ لە سەرووی چاکە و خراپەوە دەبینن ودادەنەن، ناتوانن بەمجۆرە پاکانە بۆ رەفتاری خۆ بکەن. بۆ نموونە ئیڤارکارانو لە پێناوی وەدی هاتنی بیری (ئازادی باڵندە ئاسا)ی خۆیدا بەسات کۆی لە پێشێل کردنی چاکە و خراپە نەدەکردەوە. ئێمە دەزانین کاکڵەی بیرەکانی ئەو بریتی بوو لە: خەباتی بێ وچان دژی بزووتنەوەی رزگاری پرولیتاریا. بۆیە خۆدانان لەسەروی چاکە و خراپەوە لەلای ئەو ئەوەی دەگەیاند کە ئەو فشە مافەش بە کرێکاران رەوا نەبینرێ کە بە زەبری خەباتی خۆ لە چنگی کۆمەڵگەی بورژوایی دەری هێنابوو. دیارە لەم حاڵەتەدا ئەگەر ئەو سەرکەوتبا ئەوا سەرکەوتنەکەی ئەو دەبووە مایەی زیاد بوونی خراپە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا نەك کەمبوونی خراپە.

بەمجۆرە بازدانی ئەو بەسەر چاکەو خراپەدا، واتە گیرسانەوەی لەسەروی چاکەو خراپەوە بە هیچ جۆرێ قابیلی چاوپۆشی نەبوو، هەر کاتێ مەبەست ئەوە بێ کە بە ئامانجێکی کۆنەپەرستانە بگەی، ئەوا مەسەلەی سەروی چاکەو خراپە لنگە و قوچ دەبێتەوە و هەرگیز قابیلی چاوپۆشی نابێ.

لەوەیە رەخنەی ئەوە لەمن بگیرێ کە ئەگەر ئیڤارکارانۆ لە روانگەی پرولیتاریاوە نەتوانێ پاکانە بۆ رەفتاری خۆی بکا ئەوا بێگومان لە روانگەی بورژوازییەوە ئەمەی بۆ دەکرێ. من لاریم لەم بۆچونە نییە و تەواو دروستە. بەلام لەم حالەتەدا روانگەی بورژوازی دەکاتە روانگەی کەمایەتییەکەی خاوەن ئیمتیازی بەرچاو تەنگی ئەوتۆ کە دەیەوێ تا ئەبەد درێژە بەتەمەنی ئیمتیازاتی خۆی بدات. بەلام روانگەی پرۆلیتاریا دەکاتە روانگەی ئەو زۆربەیەی کە دەیەوێ هەموو جۆرە ئیمتاێك بسڕێتەوە و لە نێوبەرێ، بۆیە وەختێ کە دەگوترێ رەفتاری کەسێك لە روانگەی بورژوازییەوە پەسندە و پاکانەی خۆی هەیە، دەبێ ئەوەش بگوترێ کە رەفتاری ئەو کەسە لە روانگەی هەموو ئەو کەسانەوە کەنایانەوێ داکۆکی لە بەرژەوەندی چەوسێنەران بکەن، دزێوو ناپەسەند و مەحکەمە. دیارە ئەم راستییە مایەی ئاسوودەیی خەیاڵی منە، چونکە پرۆسەی حەتمی گەشە کردنی ئابووری دڵنیام دەکا کە ژمارەی دەستەی دووەم روو لە زیادییە.

ئەو نۆرۆمانسیانەی کە بەدڵ (خەولێکەوتووەکان) دەبوغزێنن و نەفرەتیان لێدەکەن، دەیانەوێ وەزعەکە بشلەقێ، بەلام ئەو بزووتنەوەیەی ئەوان مەبەستیانە، بزووتنەوەیەکی موحافەزەکارانەیە و لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاری سەردەمی ئێمەدا ناگونجێ. هەموو نهێنیەکی دەروونی ئەوان لەم کارەدا



خۆی مەلاس داوە. ئەمە لە هەمان کاتدا ئەوە نیشان دەدا کە بە تواناترینیان ناتوانن بەرهەمێك بخولقێنن کە هاوتای بەرهەمی کەسانێك بێ کە جۆرە پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی و بیرکردنەوەیەکی تریان هەبووە، ئێمە پێشتر ئەوەمان ساغ کردەوە کە بیری سەرەکی شانۆنامەکەی فرانسوا گورول (خۆراکی شێر) هەڵەیە. دیارە بیری هەڵەش رەونەق و بایەخی کاری هونەری دەشکێنێ، چونکە پێکهاتی دەروونی کاراکتەرەکان دەشێوێنێ، هەڵبەتە پیشاندانی پێکهاتی دەروونی شێواوی جان دوسانسی کاراکتەری سەرەکی شانۆناکەمەی گورول کارێکی قورس نییە، بەلام ئەم کارە ناچارم دەکا لە بابەتەکە لابدەم. بۆیە بابەتێکی دی بە نموونە دێنمەوە تا بتوانم پوختەی بابەتەکە بخەمەڕوو. بیری سەرەکی شانۆنامەی (سەنگەر) ئەوەیە کە لەسەردەمی ئێمەدا دەبێ هەموو کەسێك هاوشان لەگەڵ چینی خۆیدا، بەشداری خەباتی چینایەتی بکا. بەلام با بزانین ئاخۆ بەرای بورجیت (خۆشەویسترین چارەی ئینسانی لەم درامایەدا کێیە؟)

گوشرون، ئەو کرێکارە پیرەیە کە لە کرێکارەکانی دادەبڕێ و بە گەڵ خاوەن کارو سەرمایەداران دەکەوێ. رەفتاری ئەم کرێکارە لەگەڵ بیری بنەڕەتی شانۆنامەکەدا ناکۆکە، ئەم کابرایە تەنیا لەلای ئەوانە خۆشەویستە کە بورژو پەرستی تەواو کوێری کردوون. هەستی گوشرون، هەستی ئەو کۆیلەیەی کە بەرێزەوە دەڕوانێتە کۆت و زنجیرەکانی خۆی.

کۆنت ئەلسکی تولستوی ئەوەمان نیشان دەدا کەسانێك کە بەگیانی کۆیلەیەتی پەروەردە نەبوون، زۆر زەحمەتە خۆشیان بە فیداکاری کۆیلەیەك دا بچێ و ئاوڕی لێ بدەنەوە. ڤاسیلی شیبانوف و (وەفاداری کۆیلە ئاسا)





سەرسامکەرەکەی وەبیر خۆتان بێننەوە کە چۆن وێڕای هەموو ئازار و ئەشکەنجەکانی وەکو قارەمانێك گیان دەسپێرێ:

تزار، تاقە وشەی سەرزاری ئەوە کە دەڵێ ئەرباب، هەزار ئەربابی لەدەم بەردەبێتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم قارەمانە کۆیلە ئاسایە، سەرنجی خوێنەری ئەمڕۆ ڕاناکێشێ و بە هیچ جۆرێ نایهێنێتە جۆش، چونکە زەحمەتە خوێنەری ئەمڕۆ لەوە تێ بگا کە چۆن (ئامێرێکی قسەوێژ) دەتوانێ لە پێناوی ئاغاکەیدا گیانی خۆی بەخت بکا.

جا گوشرونی پیرە مێرد لە شانۆنامەکەی بورجیت دا، هەمان شیبانۆفە کە لە (کۆیلەوە) بووە بە تازە پرۆلیتار، مەگەر تەنیا کەسانی کوێر بتوانن گوشرون بە (خۆشەویسترین وێنەی ئینسانی ئەم درامایە) بزانن، بەهەر حاڵ شتێکی بەڵگە نەویست لێرەدا بەدی دەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر گوشرون خۆشەویست بێ، ئەوان بە پێچەوانەی ویستی بورجیتەوە ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە مرۆڤ نابێ لەگەڵ چینەکەی خۆیدا بێ، بەڵکو دەبێ دوی ئەو چینە بکەوێ کە خواست و داخوازی دروستتری هەیە.

بورجیت کە ئەم کاراکتەری داهێناوە. تەواو لەگەڵ بیروبیرکردنەوەی خۆیدا کەوتۆتە ناکۆکییەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە وەختێ زیرەك و فرەزان گوشار دەخاتە سەر کەسانی دی، بەخۆی شێت دەبێ، وەختێ هونەرمەندێکی بە بەهرە و توانا ئیلهام لە فیکرێکی هەڵەوە وەردەگرێ ئەوا داهێنراوەکەی خۆی ون دەکا. جا هونەرمەندێکی ئەم زەمانە گەر بیەوێ



پشتیوانی لەبورژوازی بکا و دژی پرولیتاریا بوەستێ، بێگومان لەسەرچاوەیەکی دروستی فیکرییەوە ئیلهامی وەرنەگرتووە.

جارێکی دی دەیڵێمەوە کە هونەرمەندێکی لایەنگری بورژوازی لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا زۆر زەحمەتە بتوانێ وەکو جاران پابەندو دڵسۆزی ڕێبازی هونەر بۆ هونەر بێ. دیارە بورجیت بەم بۆچوونە قایلە و ئەوەتا زۆر بنجبڕانە هەمان مەبەست دەڵێتەوە:(لەم شەڕە ترسناکە دەروونیانەدا کە هەندێ جار پێ دەچێ یاری بەسەرلەبەری ئایندەی نیشتمان و ژیار بکا. مەحاڵە کەسێك کە بیر بکاتەوە و هەستی هەبێ و هەڵچوون و داچوونی هەبێ، بتوانێ ڕۆڵی ڕێکودەرێکی بێ گیان و بێ دەسەڵات ببینێ.)

بەڵام  لێرەدا پێویست بە ڕوونکردەوەیەك هەیە.

لە ڕاستیدا ئەو کەسەی کە مێشکی کاردەکا و هەستی لەدڵدایە ناتوانێ لەشەڕ و ململانێی ناو کۆمەڵگەی ئێستادا تەماشاکەرێکی بێ لایەن بێ. خۆ ئەگەر پێشداوەرییە بورژواییەکان مەودای دیدوروانینان تەنگ کردبێ ئەوا دەچێتە سەنگەرێکە و ئەگەر پێشداوەرییە بورژواییەکان نەیان لەوتاندبێ ئەوا دەکەوێتە سەنگەرێکی دییەوە. ئەمە حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە، بەڵام ڕۆڵەکانی بورژوازی وەکو ڕۆڵەی هەر چینێکی دی مێشکی هەموویان کار ناکات، ئەوانەش کە مێشکیان  کار دەکات و بیر دەکەنەوە، هەست و سۆزیان لە دڵدا نییە، ئەمانە ئێستاش دەتوانن لایەنگری نەگۆڕی تیوری هونەر بۆ هونەر بن. ئەم تیۆرییە بە ئاشکرا پەیوەستە بەوەوە کە گوێ بە بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و تەنانەت بەرژەوەندی تەسکی تاقە چینێکیش نەدرێ.





وا دیاره سیستەمی بورژوایی پتر لە هەر سیستەمێکی دی ئەم گوێ پێ نەدانەی پێ خۆشە و بانگەشەی بۆ دەکا. دیارە لە هەموو ئەو ژینگانەدا کە نەوە لە دوای نەوە بە بنەمای ( هەرکەس بۆخۆی و خوا بۆ هەموان) پەروەردە کراین، ئاساییە خەڵکانی خۆ پەسەندی وەها هەبن کە جگە لە خۆیان و خۆشەویستی خۆیان بیر لە چ کەسێکی دی نەکەنەوە. وەکو دەبینین لە کۆمەڵگەی بورژوایی ئەمڕۆدا ژمارەی ئەم جۆرە خۆپەسندانە لە هەموو زەمانێك پترە. موریس بارس کە یەکێکە لە تیوریسێنە هەرە گەورەکانی ئەم کۆمەڵگەیە، ئیعترافێکی راستگۆیانە لەم بارەیەوە دەکا:

(ئەخلاق و رەوشتی ئێمە، ئاین و مەزەبی ئێمە، هەستی نەتەوەیی ئێمە پاکی داروخاوەو شیرازەی پچڕاوە و ناتوانین رێ و رەسمی ژیانیان لێوە فێر ببین، بۆیە پێویستە تا مامۆستایانمان بیروباوەڕێك رۆ دەنەن، دەبێ بە ناچاری بە تاقە حەقیقەتەکە، واتە (من قاییل بن.)

وەختێ کەسێك جگە لە (من)ی خۆی هەموو شتێکی دی بەلاوە هیچ بێ، بێگومان چ شتێ ناتوانێ رێی ئەوەی لێ بگرێ کە ببێ بە پەیامنێرێکی بێ موبالاتی خەم و ساردی ئەو جەنگە گەورەیەی کە لە کۆمەڵگەی ئەوڕودا بەردەوامە. دیارە ئەمە وا نییە و بەڵکو شتێك هەیە کەرێی لێدەگرێ، ئەو شتەش دەقاودەق هەمان بێ عەلاقەیی کۆمەڵایەتییە کە بە ئاشکرا لەو نووسینەی سەرێی بارسدا دیتمان. چۆن دەشێت کەسێك لە چ عەلاقەیەکی بەم جەنگەو بەم کۆمەڵگەیەوە نەبێ، ببێ بە پەیامنێری خەباتی کۆمەڵایەتی؟ هەر شتێ پێوەندی بەم جەنگەوە هەبێ بەلای ئەوەو ناخۆش و بێزارکەرە. ئەگەر ئەم کەسە بابایەکی هونەرمەند بێ ئەوا لە بەرهەمەکانیدا چ ئاماژەیەك



بۆ ئەم جەنگە ناکات. ئەویش باوەش بە (تاقە حەقیقەتەکدا) واتە بە (من) دا دەکا و چونکە لەوەیە (من) کەی لە تەنیایی خۆی وەڕەز ببێ، بۆیە دنیایەکی سیحر ئامێز، واتە دنیایەکی بۆ دروست دەکا  کە لە سەرووی دنیای زەمین و مەسەلە زەمنییەکانەوە بێ، ئەمە کارێکە کە گەلێك لە هونەرمەندانی ئەمڕۆ دەیەکن، ئەمە بوختانێك نییە کە من بۆیان بکەم، بەڵکو بەخۆیان ئەمە دەڵێن، ئەوەتا خاتوو ز. هیپوسی لەمەڕ ئێمە دەنووسێت: (بە باوەڕی من، عیبادەت یەکێکە لە پێداویستیە سروشتی و زەرورییەکانی خودی مرۆڤ. هەموو کەسێك یا عیبادەت دەکا یا بەلای عیبادەت دا دەچێ، ئیدی گرنگ نییە ئەمە عیبادەتە ئاگایانە بێ یا نائاگایانە بێ، گرنگ نییە عیبادەتەکە یا ئەو خوایەی کە عیبادەت دەکرێ چۆن بێ، چونکە ئەمە پەیوەستە بە توانا و مەیل و حەزی هەر عیبادەتکەرێکەوە. شیعر بە شێوەیەکی گشتی و دێڕەکانی بە شێوەیەکی تایبەتی، واتە موسیقای وشەکان تەنیا شێوەیەکە لەو شێوانەی کە لەرۆحی ئێمەدا عیبادەت دەگرێتە خۆ.) دیارە موسیقای وشە و عیبادەت یەك شت نین و بۆچونەکەی خاتوو هیپوس لەم بارەیەوە بێ بنج و بناوانە. لە مێژووی شیعردا، قۆناغی دوورو درێژ هەیە کە لەو قۆناغانەدا ئەم موسیقایە، واتە موسیقای وشە چ پێوەندییەکی بە عیبادەتەوە نەبووە. بەڵام باسەکەمان لەسەر ئەمە نییە. بەڵکو بە پێویستم زانی خوێنەر بە زاراوەکانی خاتو هیپیوس ئاشنا بکەم، چونکە گەر ئەمەم نەکردبا، لەوە بوو خوێنەر پاش خوێندنەوەی ئەم چەند دێڕەی خوارەوە، کە من بە لامەوە مەبەستە، هەست بەسەر لێ شێوان بکا.

خاتو هیپوس لەسەری دەڕواو دەڵێ:

(ئایا خەتای ئێمەیە کە هەر (من) ێکی تایبەتی لە (منە) گشتییەکان جودا





بۆتەوە و ئەوانی دی لێی تێ ناگەن؟ عیبادەت بۆ هەر یەکێك لە ئێمە پێویست و نزیك و لە هەمان کاتدا بە نرخە، شیعر بە واتای ڕەنگدانەوەی پڕبوونی کانی دڵ، بۆ ئێمە پێویستە. بەڵام بۆ کەسێك کە (من)ە پیرۆزەکەی شتێکی دییە.

عیبادەتەکەی من بۆ ئەو ئاڵۆز و نامەفهوم و بێگانە دەنوێنێ. هەستی تەنیایی، مرۆڤ لێکدی دوور دەخاتەوە، پتر تەنیایان دەکا و ڕوح ناچار دەکا بە خۆیدا ڕۆبچێ، ئێمە شەرم لە عیبادەتەکانی خۆمان دەکەین، چونکە دەزانین بە هیچ کەسێکەوەمان نابەستێ، بۆیە بە دەنگی نزم بۆ خۆمانی دووبارە دەکەینەوە، و بەرەمز و هێمایەك قسە دەکەین کە تەنێ خۆمان لێی تێدەگەین.)

وەختێ خۆپەرستی بگاتە ئەم ڕادەیە، وەکو چۆن خاتو هیپوس، لە جێی خۆیدا ئاماژەی بۆ کردوە، لە ڕاستیدا (دەرفەتی توانەوە لە عیبادەت)دا واتە (لە شیعردا) لەبەین دەچێ. بەڵام شیعر و بە شێوەیەکی گشتی هونەر، کە هۆیەکە لە هۆیەکانی نزیك بوونەوەی مرۆڤ لێکدی، لە ئەنجامی ئەوەدا زیان دەبینێ و ئەو پەیامە دەدۆڕێنێ. لە تەوراتیش دا یەهودا ڕای گەیاند بوو کە تەنیایی بۆ مرۆڤ باش نییە. نموونەکەی خاتوو هیپوس، پشتیوانییە لەم قسەیە، خاتو هیپوس لە شیعرێکیدا دەڵێ:

**ڕێی من، ڕێییەکە سەخت و دژوار**
**ڕێگەی مەرگە ئەو ڕێیە**
**بەڵام هێندەی خوایەك خۆم خۆش دەوێ**
**و ئەشق ڕوحم ڕزگار دەکا.**



لێرەدا هەڵوەستەیەك پێویستە، چ کەسێك خۆی (وەکو یا هێندەی خوایەك) خۆش دەوێ؟ دیارە کەسێکی خۆپەسەندی گەوج، هەڵبەتە خۆپەسندی گەوج، ناتوانێ چ ڕوحێك ڕزگار بکا.

بەڵام مەسەلەکە ئەمە نییە کە بزانیین ئایا ڕوحی خاتوو هیپوس و هەموو ئەو کەسانەی خۆیان (هێندەی خوا) خۆش دەوێ، ڕزگار دەبێ یان نا. حەقیقەتەکە لەمەدایە کە ئەو شاعیرانەی خۆیان هێندەی خوا خۆش دەوێ ناتوانن بچوکترین ئاوڕ لەو ڕووداوانە بدەنەوە کە لە کۆمەڵگەی دەوروبەریاندا ڕوو دەدەن، بدەنەوە. کە ئەمە توانایان بێ دیارە ویستەکانیشیان ئاڵۆزە و نامەفهوم دەبێ.

خاتو هیپوس لە شیعرێکیدا بە نێو (گۆرانی) بەمجۆرە (گۆرانی دەڵێ):

**ئەفسوس! لە خەمێکی شێتانە دەمرم،**
**دەمرم و**
**خواستی خۆم نازانم.**
**نازانم**
**و نازانم لە کوێوە لە مندا هەڵایساوە**
**هەڵایساوە**
**بەڵام ئەوەی دڵ داوای دەکا، پەرجۆیەکە**
**پەرجۆیەکە**
**ئاخ، خۆزیا دەهات ئەو شتەی هەرگیز نەبووە**
**هەرگیز نەبووە**
**ئاسمانی ڕەنگ زەرد، بەڵێنی پەرجویەکی پێیە**
**بەڵێنی پێیە**
بەڵام من بۆ ئارەزوویەکی گوجراکەر بێ فرمێسك دەگریم

بێ ئەسرین دەگریم
خواستی دڵی من لەم دنیایە نییە
لەم دنیایە نییە.

راست دەکا، چونکە کەسێك کە خۆی هێندەی خوایەك خۆش بوێ و توانای تێکەڵ بوونی لەگەڵ خەڵکی دا، نەمێنێ، تەنیا ئەوەی بۆ ئەوەی دەمێنێتەوە ئومێد بە (پەرچۆ) ببەستێ و داوای شتێك بکا کە (لە دنیا دا نییە) چونکە هەر هەموو ئەو شتانەی کە هەن سەرنجی راناکێشن و سوکنایی بە دڵی نابەخشن. سێرگیونی تسنکسی لە زمانی یەکێك لە کاراکتەرەکانییەوە (بابایوف) دەڵێ (زەردوویی هونەری هێناوەتە ئاراوە) دیارە ئەم پیاوە بە هەڵەدا چووە لەوەی کە هەموو جۆرە هونەرێك (زەردوویی هێناویەتێ ئاراوە) بەڵام ئاشکرایە کە هونەرێك روو لەو تە بێ کە (لە دنیادا نییە) زادەی زەرودوویییە، ئەم هونەرە نیشانیە هەرەسی یەکجارەکی سیستەمێکی تەواوی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، بۆیە پڕ بە پێستی خۆیەتی کە ناوی هونەری روخاویان لێناوە.

دروستە، ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەی کە هەرەس هێنانی بەم هونەرە دیاری دەکرێ– واتە سیستەمی پێوەندی بەرهەم هێننی سەرمایەداری– هێشتا لە وڵاتی ئێمەدا زۆری ماوە هەرەس بێنێ، چونکە سەرمایەدای هێشتا بە تەواوەتی بەسەر سیستەمی کۆندا زاڵ نەبووە، بەڵام لە سەردەمی بوتریسی یەکەم بە دواوە، ئەدەبیاتی روسی بە تەواو کەوتە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی رۆژئاواوە. بۆیە ئەم ئەدەبیاتە هەندێ جار کەوتۆتە ژێرکاریگەری ئەو رووداوانەوە کە تایبەتن بە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکنی ئەوروپای



رۆژئاواوە و پێوەندییەکی یەکجار کزی بە پێوەندییە کۆمەڵایەتییە تا رادەیەك دواکەوتووەکانی روسیاوە هەیە.

سەردەمانێك هێندێ لە ئەشراف و دەرەبەگانی ئێمە زۆر بەگەرم و گوڕی بە پیری تیوری ئەنسکلوپیدیستەکان و بیروباوەڕی ئەوانەوە دەچوون، کە تیوۆرییەك بوو تایبەت بوو بە یەکێك لە دوا قۆناغەکانی خەباتی چینی سێیەم دژ بە ئەشراف و دەرەبەگی فەرەنسا، (پەراوێز: حاڵەتی ستایشی توندرەوانەی ئەشرافانی روسی دەرهەق بە ئەنسکلوپیدیستەکانی فەرەنسا، هەرچەندە لەباری پراتیکییەوە چ ئاکامێکی جیدی نەبوو، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا سوودبەخش بوو، چونکە هێندێ لە پێشداوەرییە ئەشرافییەکانی لە مێشکی ژمارەیەك دەرکرد. بە پێچەوانەوە هەواداری ئێستای هێندێ لە (رۆشنبیران)ی ئێمە لە بیری فەلسەفی و زەوقی ئێستاتیکی بورژوای رو لە نەمانە، زیانە بەخشە، چونکە کۆمەڵێك پێشداوەری بورژوایی کە پێوەندی بە قۆناغی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی روسیاوە نییە، لە مێشکی رۆشنبیرانی ئێمەدا جێگیر دەکا. ئەم پێشداوەرییانە، هیندێ جار کار لە خەڵکانێکی روسی دەکەن کە لە بنەڕەتدا هەواداری بزووتنەوەی پرولیتارین. بەمجۆرە تێکەڵەیەکی سەیری سوسیالزم و جۆرە مۆدەپەروەرییەکی زادەی ئاوا بوونی بورژوازییان لا دروست دەبێ. ئەم ئاڵۆزی و سەر لێ شێواوییە تەنانەت لەباری پراتیکیشەوە زۆر زیان دەخاتەوە.) لەسەردەمی ئێستاشدا زۆر لە رۆشنبیرانی ئێمە بەتاسەوە روو دەکەنە تیورییە کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و ئیستاتیکییەکانی سەردەمی هەرەس و داتەپینی بورژوازی ئەوروپای رۆژئاوا. هەڵبەتە ئەم حاڵەتی توندڕەوییە لە پرۆسەی گەشە کردنی کۆمەڵایەتی ئێمە لە پێشترە، وەکو چۆن حاڵەتە توندڕەوەییەکەی خەڵکی سادە هەژدەمیش





سەبارەت بە ئەنسکلوپیدیستەکان لە پرۆسەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی ئەو دەمە لە پێشتر بووز

(پەراوێزەکەی پێشتر لێرەوەیە، وەرگێڕ) ئەگەر سەرهەڵدان و پەیدابوونی هونەری لاواز و بێ گیان و هەرەس بردوو لە روسیادا وەکو پێویست لە رێگەی هۆکارە ناوچەییەکانەوە روون نەکرێتەوە، ئەوا ئەم کارە بە هیچ جۆرە لە ماهیەتی خودی ئەم هونەرە ناگۆڕێ. ئەم هونەرە لە رۆژئاواوە هاتۆتە وڵاتی ئێمە و لێرەشدا وەکو خۆی ماوەتەوە.

رەنگە خاتوهیپوس گلەیی ئەوەم لێ بکا کە من خۆپەسندانە و بێ ئەقڵانە تاوانبارم کردووە بەوەی کە سەبارەت بە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان بێ موبالاتە، بەڵام یەکەم من چ تاوانێکم لێ بار نەکردووە و بوختانم بۆ نەکردووە بەڵکو تەنیا پشتم بە شیعرەکانی خۆی بەستووە و رێباز و دیدوبۆچونی شیعرەکانیم نیشان داوە، ئیدی لەم کارەدا سەرکەوتووم یا بەبەسەرسەردا کەوتووم. ئەمەیان خوێنەران دەیزانن و بۆیان هەیە حوکمی لەسەر بدەن. دووەم ئاگاداری ئەوە هەم کە خاتو هیپوس ئەمڕۆکە خۆی لە لێکۆڵینەوەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانیش نابوێرێ. بۆ نموونە ئەوەتا بە هاوکاری برادەران د. مەرژۆکفسکی و د.فیلوزوف کتێبێکی کۆمەڵایەتی نووسیوە کە لە ساڵی ١٩٠٨ دا لە ئەڵمانیا بڵاوبۆتەوە. ئەم کتێبە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە خاتو هیپوس چەند پەرۆشی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی روسیایە و لێی بێ ئاگا نییە. تەنێ خوێندنەوەی پێشەکی کتێبەکە بەسە بۆ ئەوەی دڵنیابین کە نووسەرانی کتێبەکە تاقە خواستیان (شتێکە کە نایزانن) لە کتێبەکەدا ئەوە گوتراوە کە ئەوروپا ئەو کارە دەناسێ کە شۆڕشی روسیا ئەنجامی داوە،



دەیناسێ بەڵام چ ئاشنایەتییەکی بە رۆحی ئەو کارە نییە، بێگومان لەبەر خاتری ناساندنی رۆحی شۆڕشی روسیا بە ئەوروپا بووە، کە ئەو نووسەرانە ئەم مەبەستانەی خوارەوەیان بۆ ئەوروپاییەکان نەقڵ کردووە:

(ئێمەش وەکو ئێوەین، وەکو چۆن دەستی چەپ لە دەستی راست دەچێ، ئێمە لەگەڵ ئێوەدا یەکسانین، بەڵام بە پێچەوانەوە" ئەگەر کانت زیندوو بوایە دەیگوت کە رۆحی ئێمە لەسەر بناغەی تەعالی گەری رۆنراوە و رۆحی ئێوە لەسەر بناغەی دیار دەگەری. ئەگەر نیشتە زیندووبوایە دەیگوت کە ئەپولو بەسەر ئێوەدا زاڵە و دیونیزوس بەسەر ئێمەدا، بلیمەتی ئێوە لە رۆشنبیریدایە و هی ئێمە لە تەکان و بەرزەفڕیدا، ئێوە دەزانن کاتێ دەبێ بوەستی، ئەگەر دیوارێك بێتە رێتان یا دەوەستن یا بە دەوریا پێچ دەکەنەوە، ئێمە بەسەرا خۆمانی پێدا دەکەین. ئێمە زۆر بە زەحمەت دەکەوینە جۆڵە، بەڵام کە کەوتینە رێ ئیدی ناتوانین بوەستین. ئێمە ئاسایی نارۆین، غار دەدەین، بگرە باز دەدەین، هەر بە بازدان سوکناییمان نایەت بەڵکو بەسەرسەرا خۆ هەڵدەدەین، ئێوە حەز لە میانەڕەوّیی دەکەن، ئێمە لە توندرۆیی، ئێوە داد و ئینسافتان هەیە، بەڵام لای ئێمە هیچ جۆرە یاسایەك نییە، ئێوە دەتوانن هاوسەنگی رۆحی خۆتان بپارێزن و کۆنترۆڵی بکەن، بەڵام ئێمە لە هەموو دەرگایەك دەدەین تا لە دەستی دەدەین، ئێوە خاوەنی ئیمپراتۆریەتی ئێستان، ئێمە عەودالّی ئیمپراتوریەتی ئایندەن. ئێوە لە دوا شیکردنەوەتاندا قودرەت و دەسەڵاتی دەوڵەت دەخەنە سەرووی هەموو ئەو ئازادیانەوە کە بە دەستان هێناوە. کەچی ئێمە لە هەڕەتی ئەو کاتانەشدا کە کۆیلە ئاسادەست و پێ بە کۆت و زنجیرین، هەر یاخی و ئەنارشیستین، ئەقڵ





و هەستی ئێمە تا ئەوپەڕی سەلبیەت ڕێنوینی دەکرێن و ئەوجاش لە قوڵایی ناخماندا عیرفانی خۆ وەکو چۆن هەیە دەپارێزین.

لە لاپەڕەکانی دواتری ئەم کتێبەدا، ئەوروپاییەکان لەوە ئاگادار دەکرێن کە شۆڕشی روسیا بە ئەندازەی هەمان حکومەت کە شۆڕشەکەی دژ کراوە، دکتاتۆرە، هەرچەندە ئامانجی هوشیارانەو ئەزمونی شۆڕشەکە سوسیالزمە، بەڵام ئامانجە نائاگایانە و عیرفانییەکەی جگە لە ئەنارشیزم چ شتێکی دیکە نییە. نووسەرانی کتێبەکە لە ئەنجامدا ئەوە رادەگەیەنن کە رووی دەمیان لە بورژوازی ئەوروپا نییە بەڵکو لە... پێتان وایە لە پرولیتاریایە؟ غەدەر کەن و بەهەڵەدا دەچن. بەڵکو رووی دەمیان لە چەند نوێنەرێکی پەراگەندەی رۆشنبیری جیهانە کە موریدی باوەڕەکانی نیتشەن.

من نامەوێ لێرەدا چ موناقەشەیەك بکەم، تەنیا ویستومە حاڵەتی روحی هێندێ توێژی کۆمەڵایەتی نیشان بدەم و روون بکەمەوە. هیوادارم ئەو چەند قسەیەی لەسەرێ را وەکو نموونە هێنامنەوە بە ئەندازەی پێویست ئەوەی نیشان دابێ کە خاتو هیپوییس تەنانەت وەختێ کە بایەخ بە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانیش دەدا، دیسان هەمان کەسەکە لە شیعرەکانی سەرەوە را ناسیومانە، واتا هەمان رۆشنبیریی بەزیوی بازاڕی و تاك پەروەرە کە چاوەڕوانی (پەڕەجووە) دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە چ جۆرە پێوەندییەکی جیدی بە ژیانی راستەقینەی کۆمەڵایەتییەوە نییە. لوکونت دولیلی کەدەڵێ شیعر ئەمرۆکە ژیانێکی ئایدیالستی بۆ ئەو کەسانە دەرەخسێنێ کە ژیانی واقیعیان نییە. بەڵام وەختێ مرۆڤێك هەموو پێوەندییەکی مەعنەوی خۆی لەگەڵ جیهانی دەوروبەریدا لەدەست دەدا، ئەوا



ژیانە ئایدیالییەکەشی چ پێوەندییەکی بە جیهانەوە نامێنێ. لەم حاڵەتە فانتازیا بەرەو ئاسمانی هەڵدەکێشێ و دەچێتە مەداری عیرفانەوە، بۆیە بۆچونی سەراپا ئاوێتە بە عیرفانی خاتوو هیپیوس دەربارەی مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان چ شتێکی بە سوودی لەگەڵ خۆدا هەڵنەگرتووە. ئەویش وەکو هاوکارەکانی کەوتۆتە هەمان هەڵەوە کەوا دەزانێ تینوێتی ئەو بۆ (پەڕجوو) و رەفزی (عیرفانی) ئەو بۆ سیاسەت، وەکو زانستێك نیشانەی رەگەزە سواوەکانی روسیایە، (پەراوێز: هەڵبەتە ئەنارشیزمی عیرفانی ئەو کەسی نەدەترساند. ئەنارشیزم بە شێویەکی گشتی، ئەنجامێکی توندڕەوانەی سەرەتا بنەڕەتییەکانی ئایدیالیزمی بورژواییە، بۆیە زۆر جار دەبینین ئایدۆولۆگانی بورژوایی لە قۆناغی هەرەس و داتەپین دا پشتیوانی لە ئەنارشیزم دەکەن. موریس پارسش لەو کاتانەد کە سوور بوو لەسەر ئەوەی (من) تاقە حەقیقەتە، روو لە ئەنارشیزم بوو. بەڵام ئێستا چ پێوەندییەکی ئاگایانەی بە ئەنارشیزمەوە نییە، چونکە لە مێژە بەرزەفڕی بەناو تاك پەروەری بارسیانە نیشۆتەوە و باوی نەماوە. بارس، بە قبوڵ کردنی سواوترین جۆری ناسیونالزم کە بۆچوونێکی کۆنەپەرستانەیە، گەییوەتەوە هەمان ئەو باوەڕانەی خۆی کە سەردەمانێك بە (شیرازە پچڕاو)ی نێودەبردن. دیارە ئەمە جێی سەرسوڕمان نییە، چونکە توندرەوترین ئایدیالیزمی بورژوایی دەگاتە (کۆنەپەرستانەترین بیروباوەڕ) جا با خاتو هیسپوس و برادەران مژروکفسکی و فیلوزوفف ش ئەمە چاك بزانن.) رۆژاوای (بە ویقار) زۆر پێش روسیای (جەنجاڵ) خەڵکانێکی بە خۆ بینی کە لەبەر بۆچونە ناماقوڵەکان دژی ئەقڵ هەستابوون. ئەریك فالك کە یەکێك بوو لە کاراکتەرەکانی (پرزی بیشوسکی) تەنیا لەبەر ئەوە، سوسیال دیموکراتەکان





(ئەنارشیستە هۆڵ نشینەکان)ی وەك ماکی بەر دەمرێژی جنێوان دەدا کە زیاد لە پێویست باوەڕیان بە ئەقڵ هەیە. ئەمە رەگەزە بەزیوە دۆڕاوە نارووسیە دەڵێ:

(هەموو داوای شۆڕشی هێدی و ئارام دەکەن، هەموو دەیانەوێ چەرخی شکاوی ئەو مەکینەیەی کە لە حاڵی حەرەکەتدایە، بە چەرخێکی نوێ بگۆڕن، دیارە سەرلەبەری بونیادی دوگماتیزمی ئەوان بەهۆی مەنتیقە زاتییەکەیەوە، پۆچ و بێهودەیە. بێهودەیە، چونکە لەسەر بناغەی دەسەڵاتی موتڵەقی ئەقڵ رۆنراوە. ئەوەی تا نهو بەدی هاتووە، ئەقڵ بەدی نەهێناوە، بەڵکو بەهۆی حەماقەت و رووداوو پێشهاتە کزو لاوازەکانەوە هاتۆتەدی.)

ئاماژەکردنی فالك بۆ (حەماقەت) و (پێشهاتە کزوپوچەکان) هەر هەمان (پەرەچووە) کە سەرانسەری کتێبە ئەڵمانییەکەی خاتوو هیپویس و برادەران مرژۆکفسکی و قیولزوففی داگیر کردووە.

فیکرەکە هەر هەمان فیکرە و نێوەکەی گۆڕاوە، دیارە ئەمەش ریشەی لە هزرگەری توندرەوانەی بەشێکی زۆری رۆشنبیرانی بروژوایی ئەمرۆکەدا دا کوتاوە. وەختێ کەسێك کە (من)ی خۆی بە (تاقە حەقیقەت) بزانێ، زۆر بە زەحمەتە بەوە قاییل بێ کە جۆرە پێوەندییەکی بابەتی و (ماقول) واتە دیاریکراو بەهۆی یاساکانەوە— لە نێوان ئەم ( من)ەو جیهانی دەرەوەی منەکەدا هەبێ. چونکە جیهانی دەرەوەیبە بۆچوونی ئەو کەسە یا بە تەواوی نا واقیعییە یا تەنیا تا رادەیەك واقیعیەتی تێدایە. واتە تەنیا لەوە رادەیەدایە کە بونی ئەو واقیعیەتە لەسەر بناغەی تەنیا حەقیقەتەکە، واتە لەسەر بناغەی (من) رۆنرابێ، خۆ ئەگەر ئەو کەسە فەلسەفە دۆست بێ، ئەوا دەڵێ



کە (من)ەکەی ئێمە لە خەلق کردنی جیهاندا بەلای کەمەوە بەشێك لە ئەقڵ و هۆشی خۆی پێ دەبەخشێ، چونکە بابایەکی فەیلەسوف ناتوانێ بە تەواوەتی نکوڵی لە ئەقڵ و هۆش بکا.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی (من) ی خۆی بە تاقە حەقیقەت دەزانێ و چ مەیلێکی فەلسەفی لا نەبێ، ئەوا لەخۆی ناپرسێت کە (من) ی ئەو بە چ شێوەیەك جیهانی دەرێی خەلق کردووە، بۆیە لەم حاڵەدا قاییل نییە بەوەی کە لە جیهانی دەرەوەدا تەنانەت بەشێکی بچوکیش لە ئەقڵ هەیە، واتە یاسایەك هەبێ. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم جیهانە بە زادەی (پێشهاتی پوچ) دەزانێ، خۆ ئەگەر بە رێکەوت بایەخ بە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بدا، ئەوا فالك ئاسا دەڵێ سەرکەوتنی ئەم بزوتنەوەیە بەندە بە (حەماقەت)ی بەشەرەوە نەك بە پرۆسەیەکی رێکوپێکی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتییەوە. هەڵبەتە بۆچونی عیرفانی خاتو هیپویس و هەردوو هاوکارەکەی لەمەڕ بزوتنەوەی رزگاری روسیا، لە بنەڕەت دا چ جیاوازییەکی لەگەڵ بۆچونی فالك دا نییە کە رووداوە گرنگەکانی مێژوو دەبەستێتەوە بە هۆیە (پوچەکانەوە)، هەر چەندە ئەم نووسەرانە ویستوویانە لە رێگەی نیشاندانی ئازادی خوازی بێ سنووری خەڵکی روسیاوە، ئەوروپا سەرسام بکەن، بەلا بەمە دیارترین پێگەی رۆشنبیرانی بەزیویان بۆ خۆ هەڵبژاردووە، ئەو رۆشنبیرانەی کە تەنیا روو دەکەنە شتگەلێك کە (نین و هەرگیز نابن) ئەو رۆشنبیرانەی کە ناتوانن روو بکەنەوە شتگەلێ کە بەراستی هەن. بۆیە بەرهەمی سیستەمی عیرفانی ئەوان بە هیچ جۆرێ ئەو ئەنجامگیرییە ناسڕێتەوە کە من لە شیعرەکانی خاتو هیپوسەوە دەرم هێناوە.





کە دەرگای ئەم باسەم کردەوە، وا چاکە بیروبۆچونی خۆمی دەربارە، بەتەواوی بخەمە روو، رووداوەکانی سالآنی ١٩٠٥–١٩٠٦ کارێکی زۆری کردە سەر رەگەزە بەزیوەکانی روسیا، کارێکی بە هیچ جۆرێ لە کار تێکردنی رووداوەکانی سالآنی ١٨٤٨–١٨٤٩ بۆ سەر رۆمانسیەکانی فەرەنسا کەمتر نەبوو. ئەم رووداوانە جۆرە ئاوڕدانەوەیەکی سەبارەت بە ژیانی کۆمەلآیەتی لەلا بێدار کردنەوە، بەلآم ئاوڕدانەوەی بەزیوەکانی روسیا زۆر کەمتر بوو لە ئاوڕدانەوەی هونەرمەندە رۆمانسییەکانی فەرەنسا.

با بێینەوە سەر هونەری ئەمڕۆ، وەختێ کەسێك ئامادە بێ (من)ی خۆی بە تاقە حەقیقەت بزانێ، ئەو دەمە وەکو خاتو هیپیوس خۆی (وەکو خوایەك) خۆش دەوێ، هەلّبەتە ئەمە شتێکی ئاشکرا و حاشا هەلّنەگرە. جا کەسێك خۆی (وەکو خوایەك) خۆش ویست، هەنگینێ لە کارە هونەرییەکانیشی دا تەنێ بیر لە خۆی دەکاتەوە. جیهانی دەرەوە تا ئەو رادەیە لای ئەو پەسەندە دەبێ کە لەگەلّ (تاقە حەقیقەتەکە) دا واتە لەگەلّ (من)ە پیرۆزەکەدا بگونجێ. لە شانۆنامەی (کەشتی پڕ گولّ) ی سودەرماندا، خاتو ئارفلینگن لە دیمەنی یەکەمی پەردەی دووەمدا بەمجۆرە کیژەکەی دەدوێنێ: (خەلّکانی هاوپلەو پایەی ئێمە بۆیە هەن تا بەو شتانیە لەم جیهانەدا هەیە ئاسۆیەکی شادی ببەخشنە ئەو شتانەی بەبەرچاویاندا تێدەپەڕێ یا پێ دەچێ تێ ببپەڕێ. چونکە ئەوی راستی بێ ئێمە خۆمان لە حالّی حەرەکەت و تێپەڕین داین. چ سەنگ و تەرازوویەکشمان پێویست نییە بۆ سەلماندنی ئەم حەقیقەتە.)



ئەم قسانەی بەراشکاوی ئامانجی ژیانی ئەو کەسانە نیشان دەدا کە پابەندی جیهانەکەی خاتوو ئارفلینگن، ئەم کەسانە دەتونن بە متمانەی تەواوەوە قسەکانی بارس دووبارە بکەنەوە کە (من تاقە حەقیقەتە.) ئەمانە وا دەڕوانن هونەر کە هۆیەکە بۆ رازاندنەوەی ئەو ئاسۆیەی کە (پێدەچێ) بەبەرچاویاندا بڕوا.

ئەمە جگە لەوەی ئەمانە هەولّیش دەدەن چ سەنگ و تەرازویەکی زیادە بەکار بێنن، هەلّبەتە ئەوانە سەبارەت بە نیوەرۆکی ئایدولۆژی بەرهەمی هونەری یا بە تەواوی خۆ گێل دەکەن، یا بە پاشکۆیەکی خواستە میزاجییەکانی خۆیانی دەزانن، ئەو خواستانەی کە لە زهنگەری موتلّەقیانەوە هەلّدەقولّێ.

ئەوجا با بێینە نیگار کێشی.

ئەمپرسیونستەکان، بەر لە ئێستا سەبارەت بە نیوەرۆکی ئایدولۆژی بەرهەمەکانی خۆیان ئەوپەڕی خەم ساردی و بێ موبالاتیان نیشان داوە. یەکێك لەو ئەمپرسیونستانە بە قەناعەتی تەواوە بیروباوەڕی خۆی لەم بارەیەوە دەردەبڕێ، دیارە بیروبۆچونی ئەو رەنگدانەوەی بیروباوەڕی هەموو ئەمپرسیونستەکانی دیکەشە– و دەلّێ: روناکی (نور) کاراکتەری سەرەکی هەر تابلۆیەکە، بەلآم هەستکردن بە روناکی تەنیا هەستە، واتە هێشتا نەبووە بە فیکر، نیگارکێش ئەگەر خۆی تەنیا بە هەستێکەوە گرێ بدات، دیارە دەرهەق بە فیکر، خەم سارد و بێ موبالات دەبێ، هەلّبەتە ئەم تابلۆ سازە دەتوانێ دیمەنێکی جوان وێنە بکێشێ و لە راستیش دا ئەمپرسیونیستەکان گەلێ دیمەنی جوانیان وێنە کێشاوە. بەلآم دیمەنێك ناکاتە سەرلەبەری نیگارکێشی. ئێوە دیمەنی (دوا شامی مەسیح و یاوەرەکانی) داڤیشی





بێننەوە یادی خۆ، ئایا کاراکتەی سەرەکی ئەم نیگارە بەنێو بانگە روناکییە (نور)؟ ئێمە دەزانین کەبابەتی ئەم تابلۆیە بریتییە لەو ساتە دڵتەزێنەی کە مەسیح بە پێڕەوو موریدەکانی دەڵێ: (یەکێك لە ئێوە خیانەتم لێدەکا) هەموو هەوێکی لیونارد داڤنشی بریتیە لە نیشاندانی حاڵەتی مەسیح و- کە بە خۆیشی ئازار بەم کەشفکردنە سامناکەوە دەچێژێ- حاڵەتی روحی موریدەکانێتی کە ناتوانن باوەڕ بکەن بابایەکی خاین دزەی کردبێتە نێو گروپە چکۆلەکەیانەوە. خۆ ئەگەر تابلۆسازەکە وای بیر کردباوە کە کاراکتەری سەرەکی تابلۆکە دەبوا روناکی بایە، هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەم درامە بکا بە تابلۆیەك. خۆ ئەگەر ئەم تابلۆیەشی کێشابا، هەرگیز حاڵەتی روحی مەسیح و موریدەکانی نەدەکرد بە هەوێنی هونەری تابلۆکە. بەڵکو دیوارەکانی ئەو تەلارەی کە تێیدا دانیشتون، ئەو مێزەی لە دەوری دانیشتون و تەنانەت لەشی بنیادەمەکانی دەکرد بە هەوێن، جا لەو حاڵەتەدا لە بری ئەوەی درامێکی دەروونی دڵتەزێنی خستبایە بەردەممان، ئەوا کۆمەڵێك پەڵە روناکی دەخستە بەردەممان. بۆ وێنە پەڵەیەك لەسەر دیواری تەلارەکە، یەکێکی دی لەسەر فەرشەکە، یەکێکی دی لەسەر کەپوی یەهودا، یەکێکی دی لەسەر گۆنای مەسیح و ...هتد. ئەو هەستەی کە تابلۆیەکی وەهای لای بینەری بەرجەستە دەکرد، زۆر لاوازتر دەبوو، کارە هونەرییەکەی داڤنشی بایەخێکی یەکجار کەمتری دەبوو.

هەندێ لە رەخنەگرانی فەرەنسی، ئەمپرسیونیزمیان شوبهاندووە بە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا.

هەڵبەتە ئەم شوبهاندنە بێ بنج و بناوانە، چونکە ئەگەر ئەمپرسیونیستەکان ریالیستش بووبن، ئەوا ریالزمی ئەوان گەلێك سەرسەری (سگحی) بووە و لە



(توێژاڵی دیاردەکان) هێوەتر نەچووە، بەمجۆرە کاتێ ئەم تەرحە ریالزمە پێگەیەکی گرنگ لە هونەری هاوچەرخدا دەگرێ- وەکو گرتیشی- ئیدی ئەو هونەرمەندانەی لە سێبەری ئەم قوتابخانەیەدا کار دەکەن تەنێ دوو رێگەیان لەبەردەم دەمێنێ، یا خۆ بەستنەوە بە هەمان (توێژاڵی دیاردەکان) یا قوڵ بونەوە و بەزاندنی سنووری (توێژاڵی دیاردەکان) واتە پەی بردن بە هەڵەی ئەمپرسیونیستەکان و قاییل بوون بەم حەقیقەتەی کە کاراکتەری سەرەکی لە هەر تابلۆیەك دا روناکی نیە بەڵکو مرۆڤە بە هەموو هەست و بیرە جۆراوجۆرەکانییەوە، لە راسیتدا هەمان بابەت و مەبەستەکە لە بەرهەمی نیگارکێشی مۆدرندا دەکەوێتە بەرچاو. خۆبەستنەوە بە (توێژاڵی دیاردەکان) چ بەرەنجامێکی نابێ جگە لەم تابلۆ پڕ ناکۆکیانەی کە بە هۆشترین رەخنەگران لە بەردەمی دا واق وڕما و دان بەوەدا دەنێن کە نیگارکێشی هاوچەرخ بە قۆناغێکی (قەیرانی درێوی) دا دەڕوا، خۆ ئەگەر ئەوە رەچاو بکەین کە خۆ بەستنەوە بە (توێژاڵی دیاردەکان) ووە مەحاڵە، ئەوا ناچارین ناوەرۆکێکی ئایدولۆژی پەیدا بکەین و تەسلیمی ئەو شتە ببین کە لە رابوردیەکی نزیك دا دەیان سوتاند، هەڵبەتە بە خشینی ناوەرۆکی ئایدولۆژیش بە بەرهەمی خۆ کارێکی ئاسان نییە. فیکر شتێك نییە کە لە دەرێی جیهانی واقیعی دا بوونی هەبێ، رەگوریشەو و دەوڵەمەندی فیکری هەر کەسێك بەندە بە پێوەندییەکانی ئەو کەسەوە لە گەڵ جیهانی واقیعیدا، بۆیە کەسێك کە (من)ی خۆی بە (تاقە حەقیقەت) بزانێ، بێگومان لەباری فیکرییەوە زۆر هەژار دەبێ، ئەم جۆرە کەسانە نەك هەر فیکریان نییە، بەڵکو توانای وەدەست هێنانی فیکرییشیان نابێ.

وەختێ کە شتی باش نەبێ بە ناچاری بەو شتەی کە هەیە قاییل دەبی، دیارە وەختێ کە فیکرێکی ڕۆشن نەبێ، ئەوا پەنا دەبرێتە بەر هێمای ئاڵۆز و نیمچە فیکری زادەی عیرفان و سەمبولیزم و..هتد. کە هەر هەموئەمانە لە نیشانەکانی قۆناغی هەرەس هێنانن (الخگاگ).

بە کورتییەکەی ئەوەی لە بواری نیگارکێشی دا بینیمان، لە بواری ئەدەبیاتیش دا هەر وایە، واتە ریالیزم بەهۆی سستی خۆیەوە هەرەس دێنێ و کۆنەپەرستێتی ئایدیالستی زاڵ دەبێ.

ئایدیالزمی زهنی هەمیشە پشتی بەم بیرە بەستووە کە جگە لە (مـن)ی ئێمە چ حەقیقەتێکی دی نییە، لەگەڵ هەموو ئەمەشدا تاك پەروەرانی زۆروزەبەندی قۆناغی هەرەسی بورژوازی پێویست بوون بۆ ئەوەی ئەم فیکرە نەك هەر بە شێوەی دەستورێکی خۆپەسەندانە زاڵ بەسەر پێوەندییە ئینسانییەکاندا بەرجەستە ببێ– کە هەر یەکێك خۆی وەکو خوایەك خۆشبوێ– بەڵکو بشبێ بە بناغەیەکی تیوری ئەستاتیکی نوێ.

هەڵبەتە خوێنەران، بە شێوەیەکی گشتی شتێکیان لەمەڕ کوبیستەکان ژنەوتووە، بەرهەمی ئەوانیان دیتووە، پێم وایە بە هەڵەدا ناچم گەر بڵێم زۆریان کەیف پێ نەهاتوون، چونکە ئەم بەرهەمانە لایەنی کەمی ئەو شتەیان لە (من) دا دروست نەکردووە کەلە جۆرە لە زەتێکی ئەستاتیکی بچێ.

کاتی دەڕوانینە ئەم خەت خەتۆکیانەی کە لافی هونەرییەت لێدەدەن، تەنیا ئەو بیرەمان لا دەهاروژێ کە ئەمانە جگە لە (پوچی توان سێ) چ شتێکی دی نین. بەڵام (کوبیزم)ش هۆی بوونی خۆی هەیە. دیارە ئەم قسەیەش کەئەم بەرهەمانە نیشاندەری پوچییەکی توان سێیە، چ شتێك لەمەڕ ریشەو



بنەماکانی روون ناکاتەوە، ئێمەش نامانەوێ لێرەدا ئەو خاڵە روون بکەینەوە، بەڵام بەلی کەمەوە ئەوە دەخەینە روو کە دەبێ لە چ لایەنێکەوە بۆی بگەڕێین، حاڵی حازر کتێبێکی ئەلبیرت گلیز و جان میتزینگەرم لەبەردەست دایە کە دەربارەی کوبیزمە، نووسەرانی کتێبەکە هەردوکیان هەم نیگارکێشن و هەم (کوبیست).

جا با بە وردی گوێ رادێرین بزانین چۆن شێوەی بێ سەروبەری کاری خۆ روون دەکەنەوە؟ ئەوان دەڵێن: (چ شتێکی واقیعی لە دەرێی ئێمەدا بوونی نییە. ئێمە بە هیچ جۆرێ نامانەوێ گومان لە بوونی ئەو شتانە بکەین کە کار لە هەستمان دەکەن، بەڵام بە شێوەیەکی ماقوڵتر تەنیا لەو وێنانە دڵنیا دەبین کە ئەم شتانە لە هزری ئێمەدا بەرجەستە دەکەن.)

ئەم نووسەرانە دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە ئەو وێنانەی بۆ خۆ رەنگدانەوەی شتێکن، لە لای ئێمە نادیارن، بۆیە هەق بە خۆیان دەدەن کە بە پێی فیکری خۆیان شێوەیەکیان پێ ببەخشن. بەڵام بەپێچەوانەی ئەمپرسیونیستەکانەوە، ئەوەش دەڵێن کە نایانەوێ خۆیان لە چوارچێوەی هەستەکاندا زیندانی بکەن، لەم بارەیەوە دەڵێن:

(ئێمە عەودالی فاکتەری سەرەکی و بنەڕەتین، بەڵام لە خۆماندا بۆی دەگەڕێین، نەك لەو جۆرە ئەبەدیەتەدا کە زانا و فەیلەسوفان بەوپەڕی هەوڵ و تەقەلاوە سەرگەرمی دروستکردنین.)

وەکو خوێنەر دەبینێ، ئەوە هەوەڵجار لەم ئەنجامگیرییەوە بە دیار دەکەوێ هەمان فیکرە کە پێشتر ئاشنایەتیمان لەگەڵدا پەیدا کرد و (مـن) بە (تاقە حەقیقەت) حسێب کراوە. هەڵبەتە لێرەدا شێوەیەکی ئەهوەنتری گرتۆتە

خۆ. گلیز و متنزینگەر دەڵێن کە بچوکترین گومانیان دەربارەی بونی شتەکانی دەرەوە نیە، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەم دان پێدانانەدا ئەوەش رادەگەیەنن کە ئەم جیهانە نەناسراوە. هەڵبەتە ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێ کە بەلای ئەوانەوە و بۆ ئەوان چ شتێکی واقیعی جگە لە (من) ی خۆیان بوونی نییە.

جا ئەگەر ئێمە شێوەی شتەکان لە رێگەی ئە کاریگەرییەوە دەرەك بکەین کە دەیکاتە سەر هەستەکانمان، هەنگینێ دیارە کە ناشێت باسی مەحاڵیەتی ناسینی جیهانی دەرەوە بکرێ. ئێمە دەقاودەق ئەم جیهانە لە رێگەی ئەو کاریگەرییەوە دەناسین کە دەیکاتە سەر هەستەکانمان، گلیز و متنزینگەر بەهەڵەداچوون، ئەنجامگیرییەکەشیان لەمەڕ شێوەی شتەکان هەر هەڵەیە. بەڵام لە راستیدا ئەم هەڵەیان لێ ناگیرێ، چونکە خەڵکانێك لەم بابەتە هەڵانەیان کردووە کە لە بواری فەلسەفەدا زۆر لەوان بە تواناتر بوون، لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە سەرنجی ئەم خاڵە بدرێ کە ئەو نووسەرانە دەڵێن: چونکە جیهانی دەرەوە قابیلی ناسین نییە، بۆیە دەبێ (لە کەسایەتی خۆدا بۆ فاکتەری سەرەکی) بگەڕێین، هەڵبەتە دەشێت ئەم ئەنجامگیرییە بە دوو دۆر لێك بدرێتەوە. مەبەست لە (کەسایەتی) یا سەر لەبەرەی تیرەی بەشەرە، یا مەبەست تاکی تیرەی بەشەرە، لێکدانەوەی یەکەم دەمانباتەوە سەر ئایدیالزمی (تەسامی) کانت و لێکدانەوەی دووەم دەمانباتەوە سەر ئەم گەڕە لاوژەیەی کە هەر کەسێك بۆ خۆی پێوەر و پێوانەی هەموو شتەکانە. ئاشکرایە ئەم جووتە نووسەرە لێکدانەوەی دووەمیان مەبەستە و کاتێ ئەم گەڕەلاوژە و سەفسەتەیە پەسەندکرا، ئەوا لە



بواری نیگارکێشیش دا وەکو هەر بوارێکی دی دەشێت رێ بەخۆ بدرێ بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك.

گەر من لە جێی (ژنێکی شین پۆش) (ژنێکی شین پۆوش، ناوی تابلویەکی لویس لوجەر کە لە ساڵۆنی پایزی ئەخیردا خرایە روو)

چەند قەبارەیەکی ئەندازەیی دابنەم چ کەسێك بۆی هەیە رەخنە لە تابلۆکەم بگرێ؟ ژنان بە شێکن لە جیهانی دەرێی دەوروبەری من. جیهانی دەرێ قابیلی ناسین نابیە. بەم پێیە من دەبێ بۆ وێنەکێشانی ژنێك لە (کەسایەتی خۆمدا) بۆی بگەڕێم و (کەسایەتی) من شێوەی چەند شەش پالۆیەك یا چەند هاوتەرییبێکی بێسەروبەر بە ژنەکە دەبەخشێ. شەش پالۆکان هەموو تەماشەکرانی نێو هۆڵەکە دەخاتە پێکەنین. ئەمە گرنگ نییە. (جەماوەر) بۆیە پێدەکەنن چونکە لە زمانی هونەرمەند تێ ناگەن و هونەرمەندیش مەجبور نییە سازشی لە گەڵ بکا و دەستبەرداری زمانی خۆی بێ.

هونەرمەندێك کە چ جۆرە شتێك بە کەس نەدا و مەبەستی خۆی روون نەکاتەوە و چ شتێك نەڵێ، هێزێکی دەروونی لە خۆیدا کەڵەکە دەکا کە تیشکی ئەو هێزە رۆشنایی بەدەوروبەر دەبەخشێ.

هەڵبەتە تا ئەم هێزە دێتە ئاراوە دەبێ وێنەی ئەندازەیی بکێشرێ. بۆیە روبەرووی جۆرە لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتەجارانەی شیعرەکەی پۆشکین (ئەی شاعیر) دەبێتەوە:

**ئەی شاعیرە خۆپەسندەکە!**
**تۆ لە بەرهەمەکەی خۆت رازی بە؟**
**رازیت؟ کەواتە سەیر دەموکاوێی**





**جەماوەر مەکە، با تفی خۆ بکەن و**
**وا هەست بکەن کوانوی هەڵایساوی تۆ**
**دەکوژێننەوە.**
**تەختت بە شەپۆلی منداڵانەی خۆ دێننە لەرزە**

ئەم لاسایی کردنەوەیە لەو رووەوە مایەی پێکەنینە کە (هونەرمەندی خۆپەسند) لەو بارەیەوە کە ئێمە باسی دەکەین بە دیارترین شێوەی گەوجایەتی قابیل دەبێ. سەرهەڵدانی ئەم جۆرە لاسایی کردنەوەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە دیالیکتیکی ناوەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی، لە حاڵی حازردا تێوری هونەر بۆ هونەری گەیاندۆتە رادەی تەواوەتی پوچی.

مرۆڤ بۆ ئەوە نەخولقاوە بەتەنێ بژی. (تازەگەرانی) هونەری ئەمرۆ تەنیا بەو شتانە قابیل نابن کە پێشینیان دایان هێناوە، هەڵبەتە لەم رووەوە رەخنەیان لێ ناگیرێ. چونکە گەڕان بە دووی شتی نوێدا بە زۆری سەرچاوەی گەشە کردن و پێشکەوتنە. بەڵام تەنێ گەڕان بەس نییە، لە راستیدا هەموو کەسێك ناتوانێ شتی نوێ کەشف بکا. پێویستە رێگەی گەڕان بزانێ، یەکێك کە رێگەی فێربوونی شتە نوێیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی نەزانێ، و جگە لە (من)ی خۆی چ حەقیقەتێکی دی نەناسێت، دەتوانێ بە دوای (نوێدا) بگەڕێ، بەڵام جگە لە نوێیەکی پوچ چ شتێکی دی بەدەستەوە نادا. مرۆڤ بۆ ئەوە نەخولقاوە بە تەنێ بژی.

سەیر دەکەین لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ئەمڕۆدا، تێوری هونەر بۆ هونەر بەرێکی بێ تام و بۆ دەدا، تاکپەرەوەری توندرەوانەی قۆناغی ئاوا بوونی بورژوازی، هەموو دەرگا راستەقینەکانی ئیلهامی لە رووی هونەرمەند داخستووە، بەمجۆرە هونەرمەند لە ژیانی کۆمەڵایەتی دادەبڕێ و بەرەو



دووبارە کردنەوەی بێ سەمەری ئەزموونی شەخسی بێهودە و خەیاڵاتی سەرسام هێنەر و نەخۆشانەی رادەکێشێ. ئەنجامی هەموو ئەمانە شتێکە کە نەك هیچ جۆرە پێوەندییەکی بە ئەستاتیکاوە نییە، بەڵکو پوچی و بێهودەییەکی ئاشکرای هێناوەتە ئاراوە.

(جەماوەری بێ موبالات و مەغرور) ی پۆشکین بێ ئەوەی (تێبگا) گوێ لە گۆرانییەکانی شاعیر دەگرێ، پێشتر گوتم ئەم رووبەرووبوونەوەیەی پۆشکین هۆی مێژوویی تایبەتی هەیە، بۆ دەرك کردنی ئەم هۆیە ئەوەندە بەسە کە بزانین سیفەتی (بێ موبالات و غرور) بە هیچ جۆرێ سەبارەت بە جوتیارانی کۆیلەی روسیا دروست نییە، بەڵام دەربارەی (جەماوەر)ی عەوام کە پاشان شاعیری گەورەمان بوو بە قوربانی حەماقەتی ئەوان، بە تەواوەتی دروست و بەجێیە، هەموو ئەو کەسانەی کە پابەندی ئەم (خەڵکە) عەوامە بوون، بێ موبالەغە دەیانتوانی هەمان قسەکانی (خەڵك)ی شیعرەکەی پۆشکین بە وەسفی حاڵی خۆیان بزانن.

**ئێمە بێ غێرەت و هیچین**
**بێ شەرم و بەد سروشت و ناشکور**
**دڵمان، دڵی مردووی خەسیوانە**
**بوختانکەری و دوور و کۆیلەین**
**عەیب و شورەییمان لێ دەتکێ.**

پۆشکین دەیزانی کە باس کردنی شەهامەت و ئازایەتی بۆ ئەم رەشە خەڵکە بێ روح و گیانە، قسەی قۆڕە، چونکە ئەم رەشە خەڵکە لە شەهامەت و پیاوەتی حاڵی نەدەبوون، بۆیە شاعیر هەقی بوو بە غرورەوە رووی لێ وەرگێڕێ. خۆ ئەگەر هەڵەیەك لەم کارەی دا هەبووبێ، ئەوا ئەوەبوو کە وەکو

پێویست رووی لێ وەرنەگێران و ئەم کارەش جەزرەبەیەکی گەورەی لە ئەدەبیاتی روسیادا.

حاڵی حازر لە وڵاتانی سەرمایەداری پێشکەوتوودا، هەڵوێستی شاعیر بە تایبەتی و هەڵوێستی ئەو هونەرمەندەی کە نەیتوانیوە دەستبەرداری بورژوازی لێکەتوو ببێ، رێك پێچەوانەی هەڵوێستی پوشکینە. لە راستیدا ئەمڕۆکە (خەڵك) ئەوە خەڵکە راستەقینەیەی کە رەگەزە پێشکەوتووەکان لە جاران هوشیارترن، ئەوە نین کە بە حەماقەت و گەوجێتی تاوانبار بکرێ، بەڵکو ئەم تاوانە دەدرێتە پاڵ ئەو هونەرمەندانەی کە گوێ لە پەیامی رەسەنی خەڵکی (بێ ئەوەی تێی بگەن) دەگرن. کەمترین رەخنەیەك کە لەم جۆرە هونەرمەندنە بگیرێ ئەوەیە کە هەشتا ساڵێك لە مێژووی بە جێ ماوەن، ئەوانە بە شێوەیەکی منداڵانە وا هەست دەکەن بە دانە دواوە و رەتکردنەوەی چاکترین خواستەکانی سەردەم و زەمانی خۆیان درێژە بە خەباتی رۆمانسیەکان دژی بورژوازی دەدەن. ئەستاتیك ناسانی ئەوروپای رۆژئاوا و دوا بە دوای ئەوان ئەستاتیك ناسانی روسی بەو پەڕی شادییەوە پشت بە خەسڵەتی وردە بورژوایانەی بزاڤی کرێکاری ئێستا دەبەستن.

هەڵبەتە ئەم لاف لێدانەی مایەی پێکەنینە. ماوەیەك بەر لە ئێستا ریشارد فاگنر ئەوەی نیشاندا کە ئەو رەخنەیەی ئەم برادەرانە لە بزاڤی رزگاری چینی کرێکاری دەگرن تا چ رادەیەك بێ بنج و بناوانە. فاگنەر بەراستی وای بیر دەکردەوە کە لێکۆڵینەوەیەکی وردی مەسەلەکە دەری دەخا کە بزاڤی رزگاری چینی کریکار، نەك هەر بەرەو ژیانی وردە بورژوایی ناچێ، بەڵکو لێی



دوور دەکەوێتەوە و هەوڵی ئەوەیەتی بگاتە ژیانێکی ئازاد و (کۆمەڵگەیەکی هونەری)

ئەمەو خۆی لە خۆیدا هەوڵێکە بۆ ژیانێکی پڕ لە زەتی شایستە، جۆرە ژیانێك کە مرۆڤ ناچار نییە هەموو هێزی خۆی بۆ وەدەست هێنانی هۆی بژێوی تەرخان بکا.

بەکارهێنانی هەموو هێز و توانای خۆ بۆ دابینکردنی هۆی بژێوی دەقاودەق هەمان شتە کە ئەمرۆکە بووە بەسەرچاوەی هەستە وردە بورژواییەکان، گیرۆدە بوون بە ژیانی مادی رۆژانەوە.

مرۆڤ بێ توانا و ملکەچ و گەوج دەکا وای لێ دەکا ببێتە مایەی بەزەیی پێداهاتنەوە. دەیکات بە بوونەوەرێك کە توانای ئەشق یان نەفرەتی نەمێنێ. دەیکا بە بونەوەرێك کە هەموو ساتێك ئامادەیە دوا پاشماوەی ویستی ئازادانەی خۆی بەخت بکا بۆ ئەوەی کەمێك لەم نیگەرانییەی کەم بکاتەوە. ئەنجامی بزاڤی رزگای کرێکاری بریتییە لە پاکسازی ئەم نیگەرانییە حەیابەرە مرۆڤ لە مرۆڤایەتی خەرە، ڤاگنەر باوەڕی وابوو تەنیا بە لە نێوبردنی ئەم نیگەرانییەوە وەدی هاتنی ئامانجی رزگاری خوازی پرولیتاریایە کە ئەم گوتەیەی مەسیح حەقیقەت پەیدا دەکا (دەربەستی ئەو شتە مەبە کە دەی خۆی) ئەو هەق وابوو ئەمەش بڵێ کە کاتێ ئەم ئامانجە هاتە دی، هەنگینێ ئەو ناکۆکییەی نێوان ئەستاتیکا و ئەو رەوشتەی لە بەرهەمی لایەنگرانی هونەر بۆ هونەر، بۆ وێنە لە بەرهەمی فلوبێردا بەدی دەکرێ، هەموو جۆرە پایەیەکی جدی خۆی لە دەست دەدا.

فلوبیر دەیگوت: ( ئەو کتێبانەی باسی فەزیلەت و تەقوا دەکەن تاقەت بەرو پڕ لە درۆ و دەسەلەن) ناهەقی نەبوو، دیارە مەبەستی بەم قسەیە تەقوا و فەزیلەتی کۆمەڵگەی ئێستایە، واتە تەقوا و فەزیلەتی بورژوایی تاقەت بەرو پڕ لە درۆیە دەنا (تەقوا و فەزیڵەتی) سەردەمانی کۆن لە روانگەی فلوبیرەوە نە پڕ درۆ و نە تاقەت بەربوو، هەڵبەتە تاقە جیاوازی نێوان ئەم دووەش ئەوەیە کە تەقوای سەردەمانی کۆن چ ئاشنایەتیەکی لەگەڵ تاکپەرورەری بۆورژوایی دا نەبوو.

شیرینسکی– سیخاتوف وەکو وەزیری پەروەردەی گشتی نیکولای یەکەم باوەڕی وابوو کە هونەر دەبێ ( ئەم باوەڕە بسەلمێنێ کە هەر کارێکی خراپ لەم دنیاش سزای خۆی هەیە، هەڵبەتە ئەم باوەڕە بایەخی بنەڕەتی خۆی بۆ ژیانی گشتی و تایبەتیش هەیە.)

دیارە ئەم قسەیە لە درۆیەکی زلی بۆش و بە تاڵ بەولاوە چیدی نەبوو، هونەرمەندان هەقی خۆیانە لەم درۆ و دەلەسانە هەڵێن، کە لەبەرهەمەکانی فلوبیر دا ئەمە دەخوێینەوە: ( چ شتێ لە عەیب شاعیرانەتر نییە) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مەعنای راستەقینەی ئەم قسەیە ئەوەیە کە دی عەیب دەکا بە هاوتا و هاوسەنگی فەزیلەت و تەقوای پڕ لە ریاو تاقەتبەر و دۆرزنانەی رەوشت فرۆشانی بورژواو هاوپایەکانی شیرنسکی –شیخماتوف.

دیارە لەگەڵ لە نێوچوون و نەمانی ئەو جۆرە کۆمەڵگەیەدا کە سەرچاوەی ئەم فەزیلەت و تەقوای ریاکارانە و تاقەت بەرو درۆزنانەیە بووە، پێداویستییەکانی بانگەشە بۆ عەیبەش لە نێو دەچێ. حارێکی دی دەیڵێمەوە کە تەقواو فەزیلەتی سەردەمانی کۆن لە روانگەی فلوبیرەوە نە تاقەت بەر



بوو، نە درۆزنانە بوو. لە گەڵ ئەوەشدا توانی بە زەبری جیهانبینی سیاسی و کۆمەڵایەتی پاشکەوتوانەی خۆی لە کاتی ستایشی ئەم فەزیلەت و تەقوایەدا لەبەردەم رەفتاری نیرون دا کە ئەویش شتێك بوو لە نەفی و رەفز کردنی دێوی ئاسای ئەو فەزیلەت و تەقوایە، خۆی بدزێتەوە و دوورە پەرێز بوەستێ.

لە کۆمەڵگەی سوسیالیستیدا، کاتێ دزێوی رەوشتی کۆمەڵایەتی لە بەین دەچێ، رەنەقی هونەر بۆ هونەریش بە شێوەیەکی مەنتیقی دەشکێ و باوی نامێنێ. ئەمرۆکە دزێوی رەوشتی کۆمەڵایەتی وەکو ئەنجامێکی حەتمی هەوڵ و تەقەلای چینی حاکم بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی خۆی دێتە بەرچاو. فلوبیر لە شوێنێکی دا دەڵێ: (هونەر یەعنی گەڕان بە دووی شتی بێفایدەدا) پیاو دەتوانێ لەم قسەیەیدا بە ئاسانی فیکری بنەڕەتی شیعرەکەی پوشکین (خەڵك) بدۆزێتەوە. بەڵام بۆ هونەرمەندێك کە بەم بیرە قاییل بێ، ئەوە دەگەیەنێ کە دژی فایدەخوازی تەسك بینانەی چینێك یا گروپکێکی زاڵ دەوەستێ. دیارە لە گەڵ لە نێوچوون و نەمانی چینەکاندا ئەم فایدەخوازییە تەسك بینانەیەش لە نێو دەچێ. فایدەخوازی و بەرچاوتەنگی چ لایەنێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەستاتیکادا نیە. هەمیشە ئەوەیە کە داوەرەکە چ جۆرە قازانجێکی شەخسی لەو دادوەرییەدا نەبێ. بەڵام قازانج و بەرژەوەندی شەخشی شێتکە و قازانج و بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی شێتکی دییە. بیرۆکەی سوودمەند بوون بۆ کۆمەڵ کە بناغەو بنەمای فەزیلەت و تەقوای سەردەمانی کۆنە، زادەی فیداکارییە، فیداکاریش دەشێت بۆ خۆی ببێ بە بابەتی دەربڕینێکی ئەستاتیکی– و مێژووی هونەریش ئەوەی سەلماندووە کە لە زۆربەی کاتدا وا بووە. دەتوانین گەلێ نموونە لە یونانییەکانەوە بێنینەوە.





هەندێ لە فەیلەسوفانی کۆن وەکە ئەفلاتون و ئەرستۆ چاك دەیانزانی کە وەختێ هەموو هێزی مرۆڤ بۆ دابین کردنی ژیانی مادی تەرخان بکرێ، ئەو مرۆڤە تا چ رادەیەك تەنەزول دەکا. لە سەردەمی ئێمەشدا ئایدولۆگانی بورژوازی لەمە تێ دەگەن. ئەوانیش باوەڕیان وایە کە دەبێ بەشەر لە ژێر باری قورس و درێژی گیروگرفتە ئابورییە هەمیشەیەکان رزگار بکرێ. بەڵام ئەو بەشەرەی ئەوان مەبەستیانە، سەربەچینی باڵای کۆمەڵگەیە و لە رێگەی چەوساندنەوەی بەرهەم هێنەرانەوە دەژی. ئەوانیش وەکو فەیلەسوفانی سەردەمە کۆنەکان چارەسەری مەسەلەکە دەبینن: دیلکردنی بەرهەم هێنەران بە دەستی ژمارەیەك لە هەڵبژاردە بەختەوەرەکان کە کەم و زۆر لە ئایدیای (سەروی بەشەر)ەوە نزیکن. بەڵام ئەگەر ئەم جۆرە بۆچونە بۆ زەمانی ئەفلاتون و ئەرستۆ موحافەزەکارانە بووبێ، ئەوا بۆ زەمانی ئێمە لە کۆنەپەرستیش زیاترە. ئەگەر یونانیانی موحافەزەکار، واتە کۆیلەدارانی هاوعەسری ئەرستۆ بە زەبری (ئازایەتی) خۆیان ئومێدیان بە پاراستنی دەسەڵات و باڵادەستی خۆ هەبێ، ئەوا ئەمڕۆکە لایەنگرانی بە دیل کردنی جەماوەری خەڵك بە گومانن لە ئازایەتی چەوسێنەرانی سەر بە بورژوازی و تەواو نائومێدن. هەر لەبەر ئەمەیە حەز دەکەن سوپەرمانێکی بلیمەت پەیدا ببێ و دەسەڵاتی دەوڵەت بگرێتە دەست و بە زەبری ویست و ورەی پۆڵاینی خۆی بینای لەرزۆکی دەسەڵاتی چینایەتی مەحکەم بکا. کەسانی بە زیوی روخاو کاتێ کە پشت ناکەنە سیاسەت، دەبن بەلایەنگری پڕ جۆش و خرۆشی ناپلیونی یەکەم.

گەر رینان، خوازیاری حکومەتێکی بە هێز بوو( کەکاتێ ئەو لە فکران رادەچێ، دێهاتیانی ساویلکە ناچار بە ئەنجامدانی بەشە کارەکەی ئەو بکا)



ئەوا ئەستاتیك ناسانی ئەمڕۆکە بوونی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بە پێویست دەزانن کە کاتێ ئەمان سەرگەرمی بەزمی خۆن.. وەکو نیگارکێشان، یا رەنگکردنی شەش پاڵوەکان و شێوە ئەندزییەکانی دی، پرولیتاریا ناچار بکا لە بری ئەوان کار بکا. ئەمانە کە بە شێوەیەکی ئورگانیکییەکە توانای چ کارێکی جیدیان نییە، لە ناخی دڵەوە بەربەرەکانی رژێمێکی کۆمەڵایەتی دەکەن کە چ جۆرە بێکاری و بەرەڵڵاییەکی تێدا نەبێ.

ئەستاتیك ناسانی بورژوازی ئەمڕۆکە لە کاتێکا کە بە قسە لە وردە بورژوایی دەدەن، بەخۆیانیش بە ئەندازەی چروکترین وردە بورژوا پارە پەرستن، موکلین دەڵێ:

(مرۆڤ وا خەیاڵ دەکا کە بزاڤێکی هونەری لە ئارادایە، لە راسیتدا بزاڤێکە لە بۆرسەی تابلۆکاندا و لە پەنای ئەمەوە مامەڵەو سەودا دەربارەی بلیمەتانی نەناسراو دەکرێ.)

ئەم مامەڵە و سەودایە دەربارەی بلیمەتانی نەناسراو، یەکێکە لە نیشانەکانی هەمان هەوڵ و تەقەلای گەرم و گوڕی زۆربەی نیگارکێشانی هاوچەرخ لە پێناوی (تازەگەری)دا. مرۆڤ هەمیشە عەودالی تازەگەرییە چونەك تێوێتی بە شتەکۆنەکا ناشکێ و سوکنایی نایەت. بەڵام دەبێ ئەوە بزانرێ بۆچی شتە کۆنەکان تیوێتی ناشکێنێ. بەلای گەلێك لە هونەرمەندانی مۆدرنەوە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە تا ئەو کاتەی خەڵکی ستایشی شتە کۆنەکان بکەن، بلیمەتی تایبەتی ئەوان دەرناکەوێ و بە (نەناسراوی) دەمێنێتەوە ئەمەش دەکاتە کارێك کە ئەوان دژی شتە کۆنەکان هەستن.





هەڵبەتە ئەمە ئاشق بوونی فیکرێکی تازە نییە. بەڵکو هەمان ئاشقێنییە لەگەڵ (تاقە حەقیقەت) واتە ئاشق بوونە بە (من)ی ئازیز.

بەڵام ئەم ئەشقە ناتوانێ ببە بە سەرچوەی ئیلهام بۆ هونەرمەند، بەڵکو ناچاری دەکا لە روانگەی بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە بڕوانێتە هەموو شتێ. موکلیر لەسەری دەڕواو دەڵێ:

مەسەلەی (مالی) بە جۆرێ ئاوێتەی مەسەلەی هونەرە کە رەخنەگری هونەری لە دوو لاوە کەوتۆتە ژێر گوشار، چاکترین رەخنەگران ناتوانن هەموو فیکری خۆی دەربڕن. خۆ ئەوانی دی تەنیا دەیانەوێ شتێ بڵێن کە دەستکەوتێکی تێدابێ، چونکە دەبێ بەمجۆرە بژین. من نالێم نەفرت لە هەموو شتێ بکرێ، بەڵام چاکتر وایە ئاگاداری ئاڵۆزی مەسەلەکان هەبین.
دەبینین کە هونەر بۆ هونەر بووە بە هونەر بۆ پارە و ئەوەی کە بەلای موکلیرەوە خەمە، دیاریکردنی هۆیەکانی ئەم وەزعەیە و ئەم کارەش زۆر زەحمەت نییە.

زەمانێ بوو،– وەك سەدەکانی ناوەڕاست– کە تەنیا بەرووبوومی زیادە واتە ئەوەی لە مەسرەف دەمایەوە، ئاڵوگۆڕ دەکرا. دیسان زەمانێکی دی بوو کە نەك هەر بەربوومی زیادە لە مەسرەف، بەڵکو هەموو بەرووبووم و بەرهەمێك، سەرلەبەری بەرهەمە سەنعەتییەکان هاتنە خانەی بازرگانییەوە.

ئەنجام زەمانێك هات تەنانەت ئەو شتانەش کە بەلای مرۆڤەوە قابیلی ئاڵ و وێڵ و گوێزانەوە نەبوون. هاتنە خانەی ئاڵوگۆڕ و قاچاخەوە و گوێزانەوەیان بوو بەباو. ئەمە زەمانێکە کە شتەکان تا ئەو دەمە قابیلی گوێزانەوە بوون، بەلا هەرگیز ئاڵوێڵیان پێ نەدەکرا. دەبەخشران، بەلا هەرگیز نە



دەفرۆشران. بە دەست دەهێنان، بەڵام هەرگیز نەدەکردران– وەکو تەقوا، خۆشەویستی، باوەڕ، زانست و ...هتد و ئەنجامیش هەموو شتێك هاتۆتە خانەی بازرگانییەوە. ئەم زەمانە زەمانی فەسادی گشتییە، هەموو شتێك بووە بە پارە، هەموو شتێك لە حەقیقییەوە بیگرە تا حقوقی، بووە بە پارە، دەبرێ بۆ بازاڕ تا نرخی تەواوی بۆ دیاری بکەن.

ئایا دەشێت لە قۆناغێك دا کە هەموو شت بەندیواری پارە بێ تەعەجوب لەوە بکرێ هونەریش بخرێتە خزمەتی پارەوە؟

موکلیر نایەوێ بڵێ کە پێویستە سەبارەت بەم وەزعە بێزاری و نەفرەت دەربردرێ. منیش لای خۆمەوە نامەوێ لەباری سەرنجی ئەخلاقییەوە ئەم مەسەلەیە تاوتو بکەم. من دەمەوێ نەیپێبکەنم، نە بگریم، بەڵکو تێبگەم، من نالێم هونەرمەندانی ئەمرۆ دەبێ ئیلهام لە بزاڤی رزگاری پرولیتاریاوە وەربگرین. نە ئەوە نالێم، بەڵام ئەگەر درەختی سێو پێویستە سێو بگرێ، ئەوا پێویستە درەختی هەرمێش، هەرمێ بگرێ. هونەرمەندانی لایەنگری بورژوازیش دەبێ دژی بزاڤی پرولیتاریا بن. هونەری قۆناغی (روخاو) دەبێ (روخاو) بێ، ئەمە کارێکی حەتمییە، بەڵام وەکو چۆن لە مانیڤێستی حیزبی کومونیست دا هاتووە:

(کاتێ کە جەنگی چینایەتی دەگاتە قۆناغی دیاری کەری خۆی، پرۆسەی لەبەر یەك هەڵوەشانەوەی چینی سەردەست و سەرلەبەری کۆمەڵگەی کۆن توندوتیژییەکی ئەوتۆ دەگرێتە خۆکە بەشێکی بچووك لە چینی سەردەست لێی جودا دەبێتەوە وپێوەندی بە چینی شۆڕشگێڕەوە دەکا، واتە پێوەندی بەو چینەوە دەکا کە ئایندە و پاشەڕۆژی لە خودی خۆیدا هەڵگرتووە. وکو چۆن لە رابوردوودا هێندێ لە ئوروستوکراتەکان پێوەندییان بەبورژوازییەوە کرد، ئەمرۆکەش هێنێ لە بورژوازیان پێوەندی بە پرولیتاریاوە دەکەن،

بەتایبەتی ئەو ئایدولۆگە بورژوایانەی کە گەیشتونەتە رادەی تێگەیشتنی تیۆری بزاڤی مێژوویی.)

لەنێو ئەو ئایدولۆگە بوروژواییانەی کە پێوەندییان بە پرولیتاریاوە کردووە، ژمارەیەکی یەکجار کەم، هونەرمەند هەن. رەنگە لەبەر ئەمە بێ کە تەنێ ئەو کەسانەی بیر دەکەنەوە بتوانن بگەنە رادەی (تێگەیشتنی تیۆری سەر لەبەری بزاڤی مێژوویی) بەڵام هونەرمەندانی ئەمرۆکە، بە پێچەوانەی مامۆستایانی مەزنی سەردەمی رینسانس، یەکجار کەم بیردەکەنەوە.

بە هەر حاڵ دەتوانین بەوپەڕی دڵنیاییەوە بڵێین کە تواناو بەهرەی هەر هونەرمەندێکی راستەقینە، یەکجار بەهێزو بە برشت دەبێ ئەگەر دەرگای مێشکی بۆ بیرە مەزنەکانی رزگاری سەردەمی ئێمە بکاتەوە. بەڵام پێویستە ئەم بیرانە ئاوێتەی خوێن و گۆشتی ببێ تا بتوانێ بە شێوەیەکی هونەرمەندانە دەری ببڕێ. هەروەها پێویستە بتوانێ مودرنیزمی هونەری ئایدولۆگانی ئێستای بورژوازی بەشێوەیەکی ورد هەڵبسەنگێنێ.

چینی سەردەست، ئەمرۆکە لە وەزع و حاڵێك دا گیرساوەتەوە کە چوونە پێشتر بۆ ئەو لە حوکمی کەوتن و هەرەس هێناندایە. هەموو ئایدولۆگانی ئەم چینەش شەریکی هەمان چارەنووسی ئەون.

پێشکەوتووترینیان ئەو کەسانەن کە لە پێشنیانی خۆیان هێوەتر کەوتوون.

**حەمەکەریم عارف**

**سلێمانی**

**١٩٩١**



## حەمە کەریم عارف

* کەرکوکییە و لە ساڵی ١٩٥١ دا لە دایك بووە.
* لە ساڵی ١٩٧٥دا کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردوە.
* لە ساڵی ١٩٧٧ وە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاودەکاتەوە.
* نۆ ساڵی هەرەتی لاوی، بێ وابەستەگی حیزبی، لە پێشمەرگایەتیدا بەسەر بردووەو، وەکو بەشداریەکی مەیدانی و، ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کورد دا، شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکوك، نووسەری کوردستان، کەلتور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢ بە ناوی: گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محمدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح.ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
* لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کوردی کردووە.
* زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە، لە نرخی نەبوودان..

**تەنیا ئەوەندەیە لە فەوتان رزگاربوون و هیچی دی، هەندێك لە وانە:**

١– تیرۆژ، کۆ چیرۆك.
٢– کۆچی سوور، چیرۆك.
٣– بەیداخ، چیرۆك.
٤– داوەتی کۆچەریان، کۆ چیرۆك.
٥– لەخۆ بێگانە بوون، کۆ چیرۆك.

٦– کوچ سرخ، کۆ چیرۆك بە فارسی. وەرگێڕان:
٧– نینا، رۆمانی سابت رەحمان.
٨– نامۆ، رۆمانی ئەلبێر کامۆ.
٩– رێبەر، رۆمانی مەهدی حسێن.
١٠– شکست، رۆمانی ئەلکساندەر فەدایەف.
١١– هاوماڵەکان، رۆمانی ئەحمەد مەحمود.
١٢– بێناسنامەکان، رۆمانی عەزیز نەسین.





١٣– قوربانی، رۆمانی هێرب میدو.
١٤– دووره وولات، رۆمانی ع. قاسمۆف.
١٥– ئازادی یا مەرگ، رۆمانی کازانتراکیس.
١٦– چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی.
١٧– ئامانجی ئەدەبیات، م. گۆرکی.
١٨– دلێری خۆ ڕاگرتن، یاداشتنامەی ئەشرەف دەهقانی.
١٩– مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عەزیز شەریف.
٢٠– مێژوی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا.
٢١– خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعود ئەحمەد زادە.
٢٢– کورد، گەلی لەخشتە براوی غەدر لێ کراو، د.گوینتەر دێشنەر.
٢٣– لەمەهابادی خوێناویەوە بۆ کەنارێن ئاراس. نەجەف قولی پسیان.
٢٤– گوزارشتی موسیقا، د. فواد زەکەریا.
٢٥– دەرباری شیعرو شاعیری، رەزا بەراهەنی.
٢٦– ڤنست ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایزلەر.
٢٧– بەدوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل ئەلقەیسی.
٢٨– جولەکەکەی ماڵتە، شانۆنامە، مالرو.
٢٩– داد پەروەران، شانۆنامە، ئەلبێر کامۆ.
٣٠– بەد حاڵی بون، شانۆنامە. ئەلبێر کامۆ.
٣١– چاو بەچاو، شانۆنامە، گەوهەر موراد (غولام حوسێن ساعدی).
٣٢– ریچاردی سێیەم، شانۆنامە. شکسپێر.
٣٣–گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عبدوڵلا ئەلبوصێری.
٣٤– کورد لەئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا.
٣٥– هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی. پلیخانۆف.
٣٦– پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت. ئیڤلین ریید.
٣٧– لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆی ئەلبێر کامۆ.
٣٨– منداڵە دارینە، چیرۆکێکی درێژە بۆ منداڵان.
٣٩– فاشیزم چی یە، کۆ چیرۆك بۆ منداڵان، یەڵماز گونەی.
٤٠– شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بومنداڵان.
٤١– زیندەخەون کۆمەڵە چیرۆکی چیخۆف.
٤٢–ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی.



٤٣– هەڵبـژاردەی چـیرۆکی فارسـی(١) کـۆ چـیرۆك: لالـە، گێـژاو، جـێ پـێ، کورتـە مێژووکی ژوورەکەم، پیاوێك لە قەفەزدا،کتێب.
٤٤– چیرۆکستان (کۆمەڵێك دەق و رەخنە).
٤٥– چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، حەمەکەریم عارف.
٤٦– گۆڤەندوزنار (فەرهەنگی فارسی–کوردی)، حەمەکەریم عارف.
٤٧– پەلکە رەنگینە، حەمەکەریم عارف.
٤٨– چەندین چیرۆکی بێگانە.
٤٩– چرنیشڤسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس.
٥٠– چایکوفسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥١– صادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی.
٥٢– خافروغ لە شیعر دەدوێ ، ژیان و بەرهەمی.
٥٣– رێبازە هونەریەکانی جیهان.
٥٤– ئەدگارئالن پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٥– یەڵماز گونەی هونەرمەندی شۆرشگێر، ژیان و بەرهەمی.
٥٦– ئەهلی دۆزەخ، جاك لەندەن، ژیانی بەرهەمی.
٥٧– ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا.
٥٨– کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی.
٥٩– لە گەنجینەی حیکایەتی تورکییەوە.
٦٠– زارۆکستان (٤ شانۆنامە بۆ مناڵان).
٦١– قوتابخانە ئەدەبییەکان رەزا سەید حسینی.
٦٢– تاراوگەی قەڵەم (کۆمەڵێك باس و لێکۆڵینەوە) حەمە کەریم عارف.

* لەڕاپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیری کـوردی دەکـات و بەرهـەمی هەمـە جـۆری نووسـراو و وەرگێـردراو بڵاودەکاتـەوە، بەتایبـەتی لـە رۆژنامەو گۆڤاری: برایەتی، خەبات ، رێگای کوردستان، پـەیمان، دەنگـی میللـەت، ڕامـان، گـوڵان، کـاروان، مـەتین، گـازی، پـەیڤ، سـەنتەری برایـەتی، رۆژنامـەی یەکبوون.

* ئـەو بەرهەمانـە و زۆری دیکـەی ئامـادەن بـۆ چـاپ و هەرکـەس وگـروپ و لایـەنێك تەماحی بڵاوکردنەوەی هەبن ،ئامادەیە بەخۆڕایی پێشکەشیان بکات...